# بەیان

گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی یە

سەرەکی ئەنجومەنی کارگێری
وسەرنووسەر
مصلح جەلالی

دەستەی نووسەران

دکتۆر کوردستان موکریانی
سکرتێری نووسین
دکتۆر احسان فؤاد
دکتۆر کاوس قەفتان
مستەفا نەریمان
صلاح شوان
مجید ندیم
سەگڤان عبدالحکیم

نەخشەکێشان و سەرپەرشتی هونەری
هناء صباح
خەت و مۆنتیف:
نزار بەزاز

دەزگای رۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی
.مەیدانی خەلانی ـ بەغدا ـ
ت 8875795 (5) خەت

لەم ژمارەیەدا

**تۆماری جەنگ**



## تکاوگلەیی

تکـایـە هەر نووسـەرێ خەتـەکـەی خۆش و شاش و جوان نەبێ،
نووسینەکەی دەخرێتە پشت گوێ.

# هێرشە خوێناوی یەکەی دڕندەکانی ئێران بۆسەر کوردستان

● سلام محمد ●

ئەگەرچی لەوەتەی مەلاکانی قوم و تاران جڵەوی حوکمڕانی ئێرانیان گرتۆتە دەست ، هیچ کەمتەرخەمی یەکیان لە وێران کردن و بۆردومان کردنی کوردستاندا نەنوواندوە بەڵام پاش شی کردنەوەیەکی وردی تاقی کردنەوە خوێناوی‌یەکانی ئەم چەند ساڵەی دوایی ئەگەینە چەند سەرەنجامێك کە هێرشی ڕژێم بۆسەر کوردستان ، پلان و پرۆگرامێکی دیاری کراوی بۆ دانەنراوە . واتە هەر لە بنەڕەتەوە پشتیان بە هیچ بنچینەیەك نەبەستووە لە دژایەتی کردن و بەربەرەکانێ ی گەلی کوردا ، تەنیا ئەوەندە نەبێت کە ئەو گەلە داوای مافی ڕەوای خۆی ئەکات و ئەو داواکاری‌یەش لەناو پەڕە ڕەشەکانی فەرهەنگی سەروپۆتەڵاك بە عەمامە پێچراوەکان ، لەگەڵ ئایندا ناگونجێ و پێویستە هەموو جۆرە چەکێك بەکار بهێنرێ بۆ نبڕکردنی .

لە سەرەتادا ، هێرشێکی ئێجگار فراوان و توندو تیژ یان کردە سەر کوردستان و کارەسات و ڕووداوەکانی سنەو سابلاخ و بۆکان نموونەی داستانی پاڵەوانێتی و نەبەزین لە مێژووی نوێی کوردستانی ئێراندا .

بە گوێرەی هەموو لێکدانەوەیەکی ڕژێم . وەبووایە پاش یەکەمین هێرش دەست بەسەر هەموو کوردستاندا بگرن و لە ڕەگەوە شۆڕشی ڕزگاری خوازی گەلی کورد ببڕن و چیتر لە وزەو توانای ئەو گەلە قارەمانەدا نەمێنێ داوای مافی نەتەوەیی بکات ، پێش ئەو هێرشە بە چەند ڕۆژێك خومەینی وتبووی :ـ

« کوردەکان کە داوای مافی نەتەوەیی ئەکەن ئەوەیان لە بیرچوتەوە کە ئێرانی ئێستا جیاوازە لە ئێرانی سەردەمی حەمە ڕەزا شا سەبارەت بەوەی کۆمارێکی . ئیسلامی‌یەو هەموو نەتەوەیەك لە بۆتەی ئاینی ئیسلامدا ئەتوێتەوە ، هەروەها خۆیان لەوە گێل کردووە کە ئێران بریتی‌یە لە چەند گەلێك و دان نانیش بە مافی ئۆتۆنۆمی ئەو گەلانەدا ئەبێتە هۆی پارچە پارچە بوونی ئێران و شێواندنی ئاینی ئیسلام !!!» .

ئەم وتەیەی خومەینی بوو بە بنچینەی دژایەتی کردنی گەلی کورد بۆ ئەم مەبەستەش گەورەترین هێرشیان سازکرد بۆسەر کوردستان و ئەوەی لەو هێرشەدا کراو هاتە دی تەنانەت لە سەردەمی تەیموورلەنك و هۆلاکۆشدا نەکراوە بەڵام ئەنجامی هێرشەکە بە پێچەوانەی لێکدانەوەی خۆیان کەوتەوەو بەم شێوەیە :ـ

یەکەم : خومەینی و دەست و پێوەندەکانی لەو باوەڕەدا بوون کە بە تەنیا هێرشێکی فراوان دەنگ زوڵاڵی گەلێکی تێکۆشەر و خاوەن مێژوویەکی پڕ لە خەبات خاپوور ئەکەن و بە سەر ناوچەکەدا زاڵ ئەبن کەچی ئەو هێرشە بووە هۆی تەقینەوەی بورکانی تووڕەیی گەل و سەرانسەری کوردستانی ئێرانی گرتەوە ، ئەمە سەرەڕای یەکگرتنی تێکڕای پارت و ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکان بۆ بەرەنگار بوونەوەی پیلانەکانی ڕژێم .

دووەم : گوایە بەم هێرشەیان بۆسەر کوردستان و بەکارهێنانی سیاسەتی تۆقاندن و زەبروزەنگ کار ئەکەنە سەر گەلانی تری ئێران و بە هیچ جۆرێك داوای مافی ڕەوای خۆیان ناکەن بەڵام ئەوەی وەکو حەقیقەت ڕوویدا ، هێرشی مەلاکان بۆسەر کوردستان بوو بە هاندەرێك بۆسەرجەمی گەلانی ئێران و چەك هەڵگرتنیان دژی ڕژێم . پاش سەرنەگرتنی لێکدانەوەی کاربەدەستان لە یەکەم هێرشدا و تێك شکانی ئەرتەش و پاسدار ڕژێم کەوتە هەڵپەی زیاد کردنی ژمارەی

هێزێکی بۆ ئەوەی ئەمجارە لە ڕێگای چەکی قورس و ژمارەی بێ ئەندازەی چەکدارەوە دەست بە سەر ناوچەکەدا بگرێت . ئەوە بوو چەند هێرشێکی تری لەو بابەتەی کردە سەر کوردستان و دیسانەوە لەسەر شێوەی جارانی لەوەبەر زیانێکی وێرانیان لێ کەوت و لافاوی تووڕەیی گەلیش هەتا دەهات سەخت ترو دژ وارتر ڕوو بە ڕوویان ئەبۆوە .

پاش کۆمەڵێ تاقی کردنەوەی ئیفلیج و ڕسوابوون و ئابڕوونکان لێپرسراوان گەیشتنە ئەنجامێك کە لە داهاتوودا شێوەیەکی تر بدەنە هێرشەکانیان ئەویش کۆمەڵ کردنی چەند هێزێکە بەیەکەوە بۆ پەلاماردانی ناوچەیەك لە یەك کاتدا ، واتە هێزە هێرش بەرەکان دەبوونە چەند بەشێکەوەو یەکێك لەو هێزانە کە ئەرکی هێرشەکەی دەکەوێتە ئەستۆ ئەبێتە هێزی سەرەکی و ئەوەکانی تریش وەکو هێزی پاڵپشت و یارمەتیدەر .
ئەوەبوو چەند مانگێك پێش ئێستا هەموو توانایەکیان لەو نەخشەیەدا کۆکردەوەو بۆ جێبەجێ کردنی ، کوردستان بووە گۆڕەپانی شەڕێکی خوێناوی .
چەندین گوند بە تەواوی سووتێنراون و شوێنەواریان نەما سەدان و بگرە هەزاران مناڵ و پیرو ئافرەت لەناوچوون و تیرەباران کران .

ئەو گوندانەی ئەکەونە هەردوولای ئەو جادەیەی سەردەشت و مەهاباد بەیەکەوە ئەبەستێتەوە یا ئەوەتانی بە تەواوی سووتێنراون ، یاخود چۆڵ کران و بە زۆرەملی دانیشتووانی بۆ خوارووی ئێران نەفی کراون بەلام ئایا هێرشەکە تا چ ڕادەیەك سەری گرتووەو چەندەش کاری کردۆتە سەر هێزی لە بن نەهاتووی پێشمەرگەکانی کوردستان ئێران .
جارێ با بزانین مەلاکانی ئێران خۆیان چۆنی بۆ ئەچن و لێکی ئەدەنەوە ،
«ڕەفسەنجانی» کە بەناوە دەمڕاستی خومەینی یە لە ئەنجومەندا ئەڵێ :ـ
« ڕێگای نێوان سەردەشت و سەقز ـ سەردەشت وخانە ، بە تەواوی خاوێن کراوەتەوەو ئێستا هێزەکانمان هات و چۆی پیادا ئەکەن» .

وەك ئاشکرایشە ، هەردو شارۆچکەی سەردەشت وسەقز دەمێکە لە ژێر دەسەلاتی هێزە ڕەگەز پەرستەکانی ئێراندایە بەلام ئەو ڕێگایەی هەردو شارەکە بەیەکەوە گرێ ئەدات لە ژێر چاودێری و سەرپەشتی کردنی هێزی پێشمەرگەدا بوو. واتە ئەوانەی سەربە ڕژێمن بە فڕۆکەی کۆپتەر لە نێوان ئەم دوو شارۆچکەیەدا هات و چۆیان ئەکرد ، بە پێی وتەکەی ڕەفسەنجانیش هات وچۆکردنی هێزەکانیان بەو ڕێگایەدا بەبێ ئەوەی پەنا بەرنە بەر بەکارهێنانی فڕۆکەی کۆپتەر دەسکەوتێکی مەزنی هێرشەکەیە .
لەڕاستیدا ، هەر لە یەکەم ڕۆژی هێرشەکەوە تا ئێستا هات و چۆکردنی ئەو هێزانە بە ڕێگای نێوان سەردەشت و سەقزدا کە بە ئوتومبیل نزیکەی پێنج سەعات ئەبێت کەوتۆتە ژێر مەرحەمەتی سوولەی تفەنگی پێشمەرگە چاونەترسەکانەوە بە جۆرێك ڕۆژ نییە زیانێکی گەورەو کاریگەر لەو هێزانە نەدەن و ڕێگایان لێ نەکەنە ئاگر .

بەسەرکردنەوەیەك خێرای ئەو دەنگ و باسانەی لە ئاژانسەکانی دەرەوەشدا بلاو ئەکرێنەوە ئەوەمان بۆ دووپات ئەکاتەوە کە ژمارەی کوژراوو بریندراری هێزەکانی خومەینی لە هەموو جارێك زیاترە .

کەواتە هێرشی درندانەی ئەم دواییەی گورگەکانی قوم و تاران بۆ سەر کوردستان لە ڕوی ستراتیژییەوە هیچ سەرکەوتنێکی بەدەست نەهێناوەو ئەگەرچی لە ئەنجامی سووتاندن و وێران کردن و بۆردومان کردندا زیانێکی گەورەیان لە دانیشتووانی ناوچەکە گەیاندووە بەلام تێك شکێنراوەو بە سەرخۆیاندا کەوتۆتەوە .
بەمەیش ، ڕۆڵەکانی کاوەی ئاسنگەر ئەو ڕاستی یە دووپات ئەکەنەوە کە کوردستان بکەنە گۆڕستانی هەموو داگیرکەر و زۆردارێك ، هەروەها جارێکی تریش ئارەقەی شین ومۆریان بە ناوچەوانی خومەینی دا هێنایە خوارەوەو هەناسەی دووکەلاوییان پێی هەلکێشاو ئەوەیان سەلماند کە ئەمرۆ بێت یا سبەی گەلی کوردی تێکۆشەرمان لە کوردستانی ئێران بە تەواوی مافە ڕەواکانی خۆی شادئەبێت .

# لە بەرەی جەنگدا

● فؤاد حسين ●

لە ماوەی تێکەڵ بوون و ژیانما لەگەڵ جەنگاوەرەکانماندا، چ لە پێشی پێشەوەو چ لە هێڵەکانی پاشەوە، یان لەچەند گەشت وگەڕان ولە پرسیارکردن وبینیندا لەکاتی هێمنی ووەختی هێرش وساتەکانی گوللە بارانىدا، لەگەڵ سەربازەکان، تا دەگەیتە سەرکردەکانی تیپ و لێپرسراوانی تر.. بە تەواوەتی ئەوەم بۆ دەرکەوت، تا چ رادەیەك عیراقیەکان ئامادەی جەنگن، ئامادەی ئەوەن ژیان و گیانی قەشەنگی خۆیان پێشکەش بە خاکی پیرۆزی نیشتمانەکەیان بکەن.. لە کۆری جەنگدا، لەوجێگاو مەڵبەندانەی کەوا مرۆڤ هەر سات مردن رەچاو دەکات ولێی نزیك دەبێتەوە، زۆر جار لەگەڵ خۆیدا جۆرە بەراووردێکی خێرایی دەکات، ئەم ووشەو زاراوانە لە پێشا سەما دەکەن، ژیان، مردن، تەمەنی مرۆڤ، منداڵ، سامان، گەنج، نیشتمان، پاراستن، داگیرکردن، کەرامەت، بێگانە، روخاندن، وێرانی، دیسان، خۆشەویستی، ئاشتی، سەربەستی، سەربەرزی، کامەرانی، پێشکەوتن، یان، رق وکینە، دوژمنایەتی، کوشتن وبرین، دواکەوتن نەزانین، نەخۆشی، سرینی مافی مرۆڤ،... هتد..!

جەنگاوەری دلێری نیشتمانەکەمان چونکە هوشیارەو بە خۆشەویستی و نیشتمان پەروەری پەروەردەکراوە، هەم تاڵی و هەم شیرینیی چیشتوە، هەم زوڵم و زۆری و هەم کامەرانی و سەربەستیی بینیوە، بەوپەری دڵخۆشی و بەگشت دڵ و گیانێکەوە، بەگشت هوشیاری و بەتەقەڵاوە رووبە رووی دوژمن رادەوەستێت.. هەر سەربازێك دەبێتە سوپایەك لەکۆری جەنگدا.. بەگوێرەی لەشکرێکی ئێرانی لە مەیدانی جەنگدا دەجولێتەوە..و ترس و لەرز دەخاتە جەرگی دوژمنەوە..

لەساتە دژوارو خەتەرناکەکاندا چارەسەری چاك و سەرکەوتوو هەڵدەبژێرێ و مێشکی بەرانبەرەکەی دەوەستێنێ و تووشی شپرزەو نوشستیی دەکات.. ئێرانیەکان بە چەشنێکی کە دەخرێنە کۆری جەنگەوە بەرەو ریگایەکی نادیار، کە هاتنەوەی مەحاڵە رەوانە دەکرێن.

بەرەو ئاگری دۆزەخ روو دەنێت و دەسوتێت و دەبنە خۆڵەمێش..

لێرەدا هۆیەکانی سەرکەوتنمان ئاشکرا دەبنەوە، راکردنی بەردەوام و شکاندنی دوژمن دەردەکەوێ، ئەوەش رەچاو دەکرێت، سەربازی ئێمە خۆفیداکردن دەکاتە ئامانجێك بۆ





پاراستنی خاك وژیان، ئەمەش دەبێتە هۆی تەقینەوەی وزەی هەرە گەورە، کە لەمە زیاتر هەیەتی ولەکات وزروفیکی تایبەتی ئاوادا ئەتەقێتەوە. . .

کەچی سەربازی ئێرانی هەست کردن بەژیان وواتای راستەقینەی ژیان لا دزراوەو لێی سەندراوە، بەرەو مردن دەچێت، بەپێی ئەوواتایەی کە دەبێتە وەسیلەیەك بۆکوشتن و نەمان [کوشتنی ژیان لە پلەی یەکەم دا] کە لەنێو دەروونیدا هۆو واتای راستەقینەی فیداکاریی دەکوژێت، مردنەکەشی بێ‌نرخ دەبێت. .

ژیانی مرۆڤ لەگشت حاڵەتێکدا، بەرزترین و پیرۆزترین و بەنرخ ترین شتە لە بواری فیداکاری پێشکەشی دەکات بۆپاراستنی ژیانی کەسانێکی تر، ئەمە ئەوپەری ئازایەتی و بەخشەندەیی دەگەیەنێت. . هەشە ژیانی خۆی بەفیرۆ دەدات و دەبێتە هۆی لەناوبردنی ژیانی خۆی وکەسانێکی تریش. . ئەوەشی بۆخولقێ یان لە توانایدا نابێت ژیانی خۆی یان ئەوانی تر بپارێزێت. .

جیاوازییش لەنێوان هەردوو حاڵەتەکەدا ئاسمان و رێسمانە.

ئەوەی لە مێژ و بکۆڵێتەوەو سەرنجێکی وردی بۆراکێشی ، بەتایبەت بۆ مێژوی چەرخی جیهانی ئیسلامی ، بۆی دەردەکەوێ کە چۆن باوو باپیران لە پێناوی خاك و گڵ و ئاوی نیشتماندا خۆیان بەخت کردوەو ژەهرە ماریان دەرخواردی دوژمن و دەستدرێژ کەرانیان داوە . . ئەو باووباپیرانە کە ناوی بەرزیان چەشن و شێوەی ئەستێرە لەروی چەتری ئاسمانی خەبات و بەرگری و رزگاریخوازی و نیشتمان پەروەریدا ئەدرەوشێتەوە ، نەوەکان شانازی پێوە دەکەن و جێگەی شانازی هەموانە .

ئێمەی گەلی دلێری نیشتمانی عێراقی ، کە باوو باپیرانمان بەسەدەها هەزاران شەهیدیان بەخشیوە لەسەر گۆرەپانی خەبات و ژیانی سەربەستیدا . . ئێمەی نەوەی ئەوان کە هەمیشە پەروەردەی هەست و بیرو باوەری ئەوانین ، لە دلێری نەواندن و چاونەترساویدا بەرەو ژیانێکی سەربەستی و شادمانی و بەختەوەری کە بە هەزارەها رۆڵەی لاوی خوێن گەرمان لە پێناویدا بەخشیوە . . ئەوا ئێستاش هەمان شێوەی ئەوان لەبەرەکانی جەنگدا . . لەسەر سنوری رۆژهەلاتی نیشتمانی پیرۆزماندا ئەجەنگێن دژی رژێمێکی بوگەنی و خوێن رێژ و نامرۆڤایەتی . . ئەورژێمە کە ناچاری کردین و تووشی ئەم جەنگەی کردین کە بە هیچ شێوەیەك . . نەگەلەکەمان و نە فەرماندەرایەتی ئەم گەلە ئاشتیخوازە ئەمەی دەویست . . بەلام رژێمی مەلاو ئاخونەکانی تاران ، کە شێوەی بوکلە بەدەستی بێگانەو ئیمپریالیز مەوە دەجولێتەوە . . هەرواش بەهان دانی لەلایەن زایۆنی و دەستەچەپەڵەکانی چەندرژێمێکی عەرەبی بۆراگرتنی رەورەوەی پێشکەوتنی عیراق بەم شێوەیە هەستا لە پێناوی بەجێ هێنانی خواست و ئامانجەکانی میرەکانی لە ئیمپریالیزم و زایۆنیزمی جیهانی ، لەو هیواو بیرورایەدا بوون کە بە زوترین کات رژێمی نوێی عێراق بەسەرکردایەتی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالست لەژێر زەبری تەنگ هەلکێشاندا هێندە ناخایەنێ ئەروخێ . . بەلام خەیاڵیان خاوبوەو . بەرەو روی راستەقینەی ئەم گەلە تێکۆشەرە بوونەوە کە چۆن گەلی یەکێتی نیشتمانی عێراقی بەیەکەوە . . بەیەك دڵ و یەك دەست و یەك برواوە راپەری دژی دوژمنان و دەستدرێژکەران . . کەچۆن شێروخەنجەری رۆڵەکانی ئەم نیشتمانە لەسەرسنوری رۆژهەلاتدا بەرزبونەتەوە . . دەدرەوشێنەوە لە ئاسمانی یەکێتی عێراقدا ، کە دوپاتێکی گەورەی یەکێتی ئەم گەلە ئەنوێنێ لە گۆرەپانەکانی پارێزی کردنی نیشتمانا .

---

# قارەمانانی قادسیەی صدام

# هەمیشە جولەبری دوژمن

● شفیق محمود جاف ●

ئەمە هەمووی لەبیرو مێشکمدا خولی دەخواردو ئەجولایەوە کاتێ کە سەیری بەرنامەی تایبەتی (المجله العسكريه )م ـ ئەکرد چەند لەو هیوایەدابووم کە یەکێ لەو سەربازانە بۆبمایەو بەشداری خۆمم بەجێ بهێنایە لە کۆڕەپانەکانی جەنگدا گۆڕەپانێکی فراوانە . . پان وبەرینە . هەستم کرد خوێنێکی گەرم بەسەرو چاومدا ئەگەڕێ تەزویەك بە لەشمدا هات . . بەرچاوەکانم کەوتە ڕەشکەوپێشکەکردن . . هەستێکی تیژ هانیمی و بردمی هەردوو چاوەکانم نا بەیەکا . . وەك بڵێ ی پاڵێك پێوەمە بنرێ بەرەو تەلەفزیونەکە وابو چاوم کردەوە ، کەچی لەسەر گۆڕەپانێکی راستەقینەدام . . . دەنگی هاژەو تەقینەوەی گولەتوپ . . . مۆشەك . . خشۆك و تانك . . . زیڕەی گولەی تفەنگ و شەست تیرو ریزکەر ، تەقەیە . . لە هەموو لایەکەوە سەنگەر پەرژینی خولین . . . نەختە نەختە خزامە ناو گۆڕەپانەوە . بەڵێ . . ئەوا سەربازەکانم لێوە دیارن نەختێکی کە هەنگاوم نا . کەس پێ ی نەوتم . . راوەستە . . تۆکێ ی . . بەڵێ . . جل وبەرگی منیش چەشنی ئەوانە . . ئایا بۆمن سەربازێك نیم شێوەی ئەوان . . ! ؟ کەوابوو بۆ پێم بڵێس راوەستە . . تۆکێ ی . . ! ؟ . . روم کردە پەرژینەخوڵینەکە . . سەربازێك بەسەرسنگدا خۆی راکێشابوە سەر پەرژینەکە ، دەت ووت چەندەها ساڵە بەوپەرژینەدا چەسپاوە . . نەختە نەختە . . هەنگاو بە هەنگاو لە تەنیشتی خوارویەوە منیش چەشنی ئەو خۆمم بەسەر پەرژینەکەدا راکێشا . . . وورده . . وورده خۆمم هەڵکێشا بۆ سەرەوە ، گەیشتمە نیوەی لاشان وپاڵی جوتە سمێڵێکی ڕەش . . سەروچاوێکی زل . . چاوی بڕیبوە ئەو دیوی پەرژینە خوڵینەکەوە ، چەشنی پڵنگێك لە پارێزی نێچیردا بێت و هەڵمەتی پرتاو ناکاوی بۆ بەرێت . . ماندو نەبیت هەڤاڵی جەنگاوەر . .

وەڵامی نەدامەوە دیاربو خەریکی ئەودیوی بەرژینەکەبو . . دووبارە ووتم . .

هەڤاڵێ جەنگاوەر . . ماندو نەبیت . .

بە نیوە چاوو لایەکەوە سەیری کردم و ووتی . . خواخۆشت بکات . . . هێندەی گوت و دووبارە روی کردە . ئەودیوی پەرژینەکە

هەڤاڵێ بەرێزو خۆشەویستم ، من بۆلای تۆ هاتووم . . چیرۆکێکم بۆبگێڕیتەوە لە چیرۆکە سەرکەوتوەکانتان . . . !! لای لێکردمەوەو ووتی . . بەخێربێیت . . . هێندەی ووت و روی کردە لای چەپی رووی پەرژینەکە . .



دەستێکی بەرزکردەوە . . هێندەم زانی لەناکاودا
سەربازێکم لێ پەیدابو ئایا چۆن هات . . لەکوێوە هات ! ؟
پێی ووت . . وەرە جێگاکەم . .
دەستی گرتم . . تەنها یەك هەنگاو جولاینەوە بۆخوارەوە . .
ووتی . . خەرمو چیت دەوێ !؟
هەڤاڵ گیان چیرۆکێك . کردەوەیەك . . بەجێهێنانی فرمانێك بزەیەك گرتی و ووتی . . سەدەها چیرۆکمان هەیە . . جگە لە کردەوەو قارەمانی نواندن و بەجێهێنانی فرمان و فەرمان فەرمو . . ئەم چیرۆکەت بۆبگێڕمەوە . . جارێ راوەستە . دووبارە تەقەبەرز بووەوە . . دوکەڵە لەهەموو لایەکی بەرەی دووژمنەوە بەرز بووەوە . . بۆنێکی بۆگەنی . . بۆنی گۆشتن و سوتاوو برژادی لاشەی جێماوەکانی دوژمن بەدەم باودوکەڵەوە هێندەی نەمابو کە وورگمان لە دەممانەوە بێتە دەرەوە لەبەر بۆگەنی ئەو دوکەڵ و رەشەبایەدا . .
تەقەوەستا . . ناوچەکە نیمچە کپیەك دایپۆشی . .
فەرمو . ئێستا چیرۆکەکەت بۆبگێرەوە . .
پاش یەکترناسین . . بۆم دەرکەوت کە ناوی «عبدالحسین »ە هەڤالەکەشی ناوی شێرۆیە . . .
ووتی کاکەشوان . . ئەوارۆژێك فەرمانمان بۆهات کە ئامادەبین بۆبەجێهێنانی ئەرکی فرمانێك . . کۆمەڵەکەمان ئامادەبوو . . هەرچەند هەمیشە ئامادەین . . کراین بەدوو بەشەوە هەربەشێکمان ئەفسەرێکی تایبەتی لەگەڵدایە ئەبێ سەنگەری سەرلووتکەی ئەو شاخە بگرین دوژمن تێیدایە . . ئەوەش دەزانین کە دوژمن ژمارەیەکی زۆری لەوێدا ئامادەو تەرخان کردوە . . بەلام جەنگ لەگەڵ ئەوەشدا بەزۆری ژمارەنیە . . بەنەخشەو پەیرەوە . . بە دلێریە . خۆراگرتنە . . چاونەترساویە بەبرواکردنە بەبیروباوەر ، بەلکەوتینەرێ . .
رێگەمان گرتەبەر ، لەژێر بۆردمانێکی تیژدا کە دوژمن دەیباراند بەسەر ناوچەکەماندا بۆمەبەستی راگرتنمان . . . پەلی یەکەممان رویکردەلای خوارەوە بەرەو دۆڵ و ناوکەن و بەرزای و هەورازەکانی لاخوارەوەو ئێمەش بەرەو هەڵمەت و دۆڵەکانی لای ژوریانەوە . تەقەیە بۆردمانێکی باران باریە گولەتوپ وەك برێشکە دێتە خوارەوە بەلام ئێمە گەیشتینە ناودۆڵ و پێچاوپێچە دەست نیشان کراوەکان . . پاش چەند سەعاتێك گەیشتینە شوێنی دانراو . لەکاتی دانراودا بەپێی نەخشە تەقە لەلای خوارووەوە بەرزبووەوە . . هەڤاڵەکانمان تەقە لە سەنگەرەکانی دوژمن ئەکەن ، بەشی کەرتی ئێمەش کەوتەرێ بەرەو هەورازەکانی . . پالی سەنگەرەکانی دوژمن کە ئەبێ داگیری بکەین . . بەڵێ سەنگەرەکانی دوژمن گەمارۆدران . . دوژمنمان پێچایەوە ناو سەنگەرەکانیان . . ئەوەی بۆیکرا چەکەکەی بەجێ هێلاو بۆی دەرچو ئەوەشی بۆنەکرایان کوژرا . . یان دەستگیرکرا . ئەمە هەموی چەندسەعاتێکی خایاند . . . بەلام بەداخەوە بڕارشەهیدمان لەو جەگەدابووە . . .
شێرۆ لە سەرەوە ووتی . . کاکە عەبدوالحسین ، ئەوەت لەبیرنەچێ . . کە چۆن بەشەو دووبارە هێرشیان هێناو هەڵمەتی سەنگەرەکانیان دا . . و چۆن بە چەکەکانی خۆیان لە دژیان وەستاین و بەرەو دوامان کردن . . وتی . . بەڵێ راستە . بەراستی ئەو شەوە . . کە تازە رۆشنایی دەگەیشتە زەوی هێرشیان هانیە سەرمان . بەلام بەراستی لەو جەنگەدا کاك شێرۆ کارێکی کردوە بەشێوەیەك جەنگی کە جێگەی رێزلێنان و هەمیشە شانازی پێوەکردنە . . رۆڵەیە بەخوا . .
لەم کاتە ویستم هەستم هێندەم زانی هێزێك داینامەوە بروابکەن هەستم بەوە کرد کە خۆمم نەگرتایە بەرەو بناری پەرژینەکە خل دەبومەوە . . . دەستی عبدالحسین بو . . رایکێشام و داینامەوە . . دانیشەبرام . . ئەوا دوژمن لەودیوی پەرژینەکەوەن چاوەچاویانە لیمان دەرکەوێ و تەقەمان لێ بکەن پاش هەناسەیەکی پربەسنگ . . روم کردە ئاسمان . . دەستی پارانەوەم بۆیەزدانی گەورە بەرزکردەوە ، بەزمانێکی پر سوپاس و پارانەوە بۆپارێزیکردنی ئەم سوپا دلێرو چاو نەترساوو خۆبەخت کەرەمان لەژێر سایەو سێبەری سەرکردایتی بەجەرگ و دلێرو تاقە شۆخە سواری گەلەکەمان هەڤالی تێکۆشەر سەرۆك صدام حسین سەرۆك کۆمار سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانمان .
پاش خواحافیزی ، هەنگاوبەهەنگاو . . وردەووردە . . رێگەم گرتەبەر بەرەوخوارووی پەرژین . . بەلام تەقە لە دوورەوەبە . . مەترسی نیە . . ئادەی خۆت بگەیەنە ناو ئەو دارستانە . . لەناکاودا سەرم بەرداره بەروونێکی گەورەکەوت نەختێ لەچەرمی سەرتێولمی داماڵی . . ئاگام لەخۆم بووەوە بەڵێ کە ئاگام بووە . . هەی . . هووە . . بەرنامەی چی . .
خۆرەپانی چی . پەرژینی چی . . !! ؟ بەڵێ ئەودەستەی کە لەژێر چنمەدادانابو تەزی و توانای راگرتنی سەروچنمی نەمابو . . ئەوە بو لەژێر چنمدا خزاو دەرچو و سەرم بەلاپاڵ دەستی کورسیەکە کەوت و ئاگای کردمەوە ، لەوخەیال و خەوە دوورو درێژەدا . . کە بەراستی ، راستەقینەکانی ئەوچەشنە خەیاڵ و خەوانە هەموورۆژێك بەدەستی سەربازانی سوپای قارەمانی قادسیەی صدام لەنێو سەرکەوتنەکانیدا بەسەر هێزەکانی رژێمی بۆگەنی ئێرانی خومێنیدا ـ تۆماردەکرێن ، هەتا گەیشتن بە سەرکەوتنێکی تەواو بەسەر ئەو دوژمنە ناپاك و خوێن رێژ و بەکرێگیراوە ،



# جەنگا چەپەل

● رمضان عیسی ●

چوار سال بورین و گوری یا
ڤی ئاگری ،
گوری یا بووشا ئاگرێ
جەنگا چەپەل
نە ڤەمریا . . .
نە ڤەمری . . !
بووچی گەلو
هەتا ئەڤرو هێلاینە هەل . . !!

★★★

چوار سال چوون و
هێشتا خوینا د رژیتن
د ناڤ خیزی دا د کەلیتن
لاو و گەنجێن تێ گەڤزین
یێت لێ حزبوین ئەلهوی و قە ل .
ئەلهوی و قەل . . !!!

★★★

دەم و دەوران
ل جیهانێ ژی چەرخین
ئەگەر چەوا
سەرێن مروڤێن شەنگ و شوخ
ل مەیدانا بێ بەختیێ ،
دێ بن کلوخ . . !!

د ناڤ کوچکێ بوسولمانەتیێ دا دێ بن
بزووت و پەل . .
بزووت و پەل . .
گەنگی جیهان
پەل و بزووتێن ڤی کوچکی
ل روژەکێ یان جارەکێ
ل سەرێن ریێێن
کاروانێ ئازادیێ دا
بوینە خەتیر ، یان ژی مەشخەل

★★★

هەی هو گەلو
ڤان دەجالان . . .
وان د ڤێتن
ئەو بسووژن وەلاتێ مە
نە مینیت گەل
وەلاتێ مە
بۆ شورەشێ و شورەشڤان
چونکو دیسا
یێ بویە کەل . .
یێ بویە کەل . .

# خومەینی و نیازی ئیمپریالزم

ئامادە کردنی : اسماعیل گەیلانی

رژێمی ئیران کە بە هێزترین بنکەی ئمپریالزمە لەم ناوچەیەدا لەبەر ئەوە ئمپریالزم ویستی بەهۆی ئەم رژێمە ئاشویە لەناوچەی عەرەبیدا بنێتەوە . بە تایبەتی ناوچەی کەنداوی عەرەبی بۆیە مەسەلەیەکی ئاسایە لەلایەن ئمپریالزم کە کاری ئاشوبەی بە رژێمی خومەینی راسپێرێت وە بۆ ئەم مەسەلەیەش رژێمی خومەینی لەژێر پەردەی ئایینی ئیسلامی ئەیەوێت نیازو فەرمانەکانی ئمپریالزم جێبەجێ بکات . . . وە لە کاتی رژێمی شاهنشاهی کە ئمپریالزم ئەیزانی رژێمی شاهی گۆربەگۆر پەرە بە پیاوە ئاینیەکان نادات بۆیە نەیتوانی بەکاری مەبەستی خۆی هەلێت ئمپریالزمیش بۆئەوەی خومەینی بۆئەم کارە هەلبژارد چنك وبەکرێ گرتەی خۆیەتی ولە دلسۆزی خومەینی دڵنیایە . بۆیە بەرە بەرە شای لاواز کردو دەوری خومەینی بەرزکردەوە بۆئەوەی جڵەوی دەسەلاتداری بەدەست بگرێت و لە شوێنی شاە دابنیشێت و ببێت بە شای تازە ئەوجا بۆیە مەلا خومەینیش پاش ئەوەی کە لە سەر تەختی شاە دانیشت دەست بەجێ دەستی کردە جێبەجێ کردنی نەخشەو پیلانەکانی ئمپریالزم ئەوەبوو پێش هەمووشتێك دەستی زۆر داری بۆعیراقی دراوسێی درێژکرد تاوەك و ئەم شەرەی بەسەر وڵاتەکەماندا سەپاند . . چنکە عراق بەهێزترین هێزە لەم ناوچەیەدا وەپارتێکی پێش کەوتوخواز رابەرایەتی ئەکات کە ئەویش پارتی بەعسی عەرەبی سوشیالستیە . . . چنکە ئەم پارتە بەو پەری دلسۆزایەتی سەرکردایەتی بزوتنەوەی شورشی عەرەبی ئەکات و قەلای سەختی خەبات وتێکۆشانە دژی ئمپریالزم و زایۆنزم واتە ئەگەرەیەکی زۆر بەرزو بەهێزە لە بەردەم خومەینی چاوچنۆك و بەکرێ گیراوی ئمپریالزم وزایونزم بۆیە مەحالە بهێلت پیلانی ئمپریالزم وزایونزم و هەموو زۆر دارێك سەرکەوێت لەم ناوچەیەدا انجا لەبەر ئەوە لای خومەینی وابو کە شتێکی زۆر ئاسایە کە شەری لەگەل بەرپا بکات . . چنکە ئەم بێمێشکە وای لێك ئەدایەوە کە بەسوپای زۆرو چەکی امریکی ئەتوانێت خاکی عیراقمان داگیر بکات و گەلەکەمان ببەزێنێت ئەو گەلەی کە باوەری بەسەرکردایەتی سیاسی و مێژوویی پارت و شورش هەیە باوەریەکی پتەویشی هەیە بە سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین . . .

بەلام گەلی عیراقمان بیروباوەریان زۆر بەهێزەو هەموو کاتێك خوێنی خۆیان هەرزانترین نرخە بۆبەخشین بە خاکی نیشتمانی خۆیان و نەتەوەی خۆیان . . . گەلی عیراقی خۆشەویست و سوپایی عیراق بەهێزو بەتوانا باوەریەکی زۆر پتەویان هەیە بە ئامانجەکانی پارت و شۆرشیان دلسۆزیی گەلی عیراق و سوپایی عیراق لە یەقینەکی قولەوەدێت ئەم دلسۆزیەش بۆ هەموو لایەکی جیهان بلاوبووەوە لەو کاتەی کە بەرپەچی رژێمی مەلاخومەینی دایەوە لە هەموو پیلان و هێرشە چەپەلەکانیان لە بەرەکانی جەنگا وە سوپاو سوپایی مللی و هەموو هێزە چەك هەلگرە

بەشەرەفەکانی عیراق توانیان داستانی پالەوانێتی لە مێژووی زێرینی عیراق و عیراقیەکان تۆمار بکەن . . . وە سەربەخۆی و سەربەرزیی وولات و دەسکەوتە مەزنەکانی شورشی عیراق شورشی پرشنگدرایی هاولاتی عیراق بپارێزن . . . رۆڵەکانی عیراق سنگیان کردە قەڵغانی بەرگری کردن لە خاکی عیراق هەموو عیراقیەکان بەگەنج ولاو پیرو ئافرەت دەستیان بەرزکردۆتەوە داوا ئەکەن بەشداری لە جەنگی قادسیەی صدام دا بکەن هەروەك وبەردەوامیش لە بەشداریی کردنیان لە جەنگی رەوادا جەنگی شەرەفمەندی . . . دایکان و خوشکان شانازیان بە رۆڵەو براکانیان ئەکرد کە بەخوێنی پاکی گیانی خۆیان خاکی نیشتمان ئەپارێزن ئائەمەیە مرۆڤی عیراق نوێ کە لە ژێر سێبەری شورشی 17 ـ 30 تموزی نەمردا کە پارتی بەعسی عەرەبی سوشیالست پشتی پێ ئەستورەو باوەریشی هەرگیزاو هەرگیز بەم گەلە مەزنە لەق نابێت بانۆکەران و هەموونیاز چەپەلەکان لە داخان یاخەیی خۆیان هەڵدرن .

توانای ملەتی عیراق مایەی سەرسورمانی دۆست و دوژمنانیەتی لە هەموو جیهاندا چنکە ملەتی عیراق ئەوەی بۆ هەموو جیهان سەلماند کە بەرەی ناوخۆی عیراق زۆر بەهێزو پتەوە . . . گەلی عیراق دەستی خستوتە نێو دەستی یەکترو باوەریان بەسەرکردایەتی مێژوویی پارت و شورش زۆر بەتینە بەرابەرێتی شۆرەسواری نەتەوە صدام حسین کە دەورێکی بالای هەبوو هەیەتی لەتێك شکاندنی هێزەکانی زۆرداریکەر ئەم لایەنەش دەورێکی قولی هەیە لە کارتێ کردنی باری نێو خۆی ئێران لە هەموو بوارەکاندا . . . بۆیەش جەماوەری ئێران هوشیار بونەوەو راست تاقمی خومەینیان بۆ ئاشکرابوو . . بۆیە بەرە بەرە گەلە بەشەرەفەکانی ئێران لەم رژێمە دورکەوتنەوەو دەستیان کرد بە پەرە پێدان خەباتی چەکدارانەیان دژ بە رژێمی نۆکەر تاوەك سەرەولێژ کردنی و کوتایی هێنانی ئەم بارو دۆخە نائاساییەیی کە ئێران پیایدا ئەروات لەبەر سێبەری کۆمارە نائیسلامیەکەیی خومەینی . . . بنیات نانی کۆمەلگایەکی دیمکرات و یەکگرتوو کە لەبەرسێبەری گەلان ئێران بە هەمو جۆرە یەکسانیو سەربەستی بژین . . . خومەنیش هەرچەند ئمپریالزم و زایونی دوژمن هاریکاری بن بۆ درێژ پێدانی زۆرداریەکەیی بۆسەر ناوچەو کپ کردنی دەنگی گەلانی ئازادی خواز بەم کارە زیاتر تێکۆشانی گەلانی ئازاد ـ بخواز گەرم وگوڕتر ئەبێت . .

مردن و سەرشورشی هەر بەشی خومەینی و نۆکەرانیەتی . ملەتی عیراقیش هەموو شتێك ئەبەخشێت لە پێناو سەرکەوتنی تەواوەتی و سەرشۆریش هەر بەشی خومەینی و نۆکەرانیەتی ملەتی عیراقیش هەموو شتێك ئەبەخشێت لە پێناو سەرکەوتنی تەواوەتی و سەرکەوتنیش هەر بەهرەی وولاتی قادسیەی صدام حسینە . بەرابەرێتی پارت و شورش و هەموو عیراقیەکی شەرەف مەند . . .



# سەید ئەحمەدی نەقیب

## ١٨٦٠ - ١٩٢٧

سۆران مەحوی

**سەیـد ئەحمـەدی نەقیب، لەگـەڵ ئەوەی شاعیـرێکی بەهـرەمـەند بووە. . بە زانـایـەکی ناودارو لە خواتـرس و موتەسەوفێکی بێ ڕیاش ناسراوە.[1]**

شیعـرەکـانی زۆری دەرهـەق ستـایش کردنی پێغـەمبـەرو پیـاهـەڵـدانـی یارانـی بووە. . سەرەرای ئەوانـەش لە شیعـرەکـانیدا، گەلێ بابـەتی وەك: ـ سەرزەنشی کـردن و پلارهاویشتن دژی دزو جەردەو پیاو خراپان تێ کەوتووە.

ئەم شاعیـرە نادیـاروونـە، تا دەرحـاڵ خامـەی بە برشتی توێـژینەوەو لێکۆڵەرەوانی ئەدەبی نەگەیشتوێتی و لە[2] ئاسمانی مێـژووئەدەبی کوردی نازدارمـان دابێ دەنگ و خامۆشە سەید ئەحمـەدی نەقیب، کە بە کەڵـە پیـاوێکی بنـەماڵەی شێخانی سلێمـانی دادەنرێت. . کوری شێخ مەحمودی نەقیبەو باوکی کورەزای زانا شێخ حەسەنی گڵە زەردەیە.[3]

شێخ موحەمەدی نودێیی باوەگەورەشیان بە وەجاخزادەی ساداتی بەرزنجە دەژمێرێت.[4]

ئەم شاعیـرە لێ هـاتووە، لە ساڵی 1860دا لە سلێمانی لە دایــك دەبێت و هەر لەوێش لە سەر دەستی مەلا ناودارەکـانی ئەو سەردەمــەداو بە تایبـەت لە خزمـەت زانـای گەورە (شێخ مستـەفـای موفتی)[5]دا کە دەبێتە خاڵی حاجی کاك ئەحمەدی شێــخ، خوێنـدن و تە حسیلی تەواوکـردوە خواڵێخـۆش بوو سەیـد ئەحمـەد، گەلێ دانـان و تەئلیفـاتی زۆر بایـەخدارو پڕ سوودی لە گشت بەش و لقەکانی (ئەدەب و زانست)دا هەبووە. .

بەلام داخمان ناچێت، بێجگە لەو دیوانە شیعرەمەزنەی کە وەك کەلەپوورێکی نەتەوەیی وایەو لە لایەن (شێخ رەئووفی سەید نوری) برازایەوە، کە شیعر وبیستوو ئەدەب دۆستێکی ..شە پاریزراوە. .

ئیتر ئەو هەموو گەنجینە بە نرخەو رەنجەی شاعیر کە داوێتی ن‌ی بێ وەربووە.(٦)

خوالێ خۆشی بوو سەید ئەحمەد لە ساڵی 1898دا لە سەفەرێکی دا رێگای دەکەوێتە ئەستەمبوڵ و لەوێشەوە دەچێتە لای سووڵتان سووڵتان عەوبدول حەمیدریش بە حوکمی زانای شاعیرو رێ و شوێنی لە بنەماڵەی شێخان دا. . سەید ئەحمەدی بە دڵا دەچێت و نەوازشێکی زۆرو رێزێکی تەواوی دەگرێت سەرئەنجام بە فەرمانی سووڵتان بریاری بۆ دەردەکرێت، کە مووچەو مانگانەیەکی باشی بۆ مزگەوتەکەی ببرێتەوە.(٧)

خوا هەقە ئەویش درێخی لەو مووچە یە هیچ ناکات و هەمووی بۆلێ قەوماوان و هەژارانی ئەو سەردەمە سەرف دەکات. سەید ئەحمەد دوای گەرانەوەی لەو سەفەرەی، خولیای زیارەت کردن و چوونە (حەج) کردنی دەچێتە سەرەوە. جابۆ ئەو مەبەستە لە ساڵی (1927)دا، بۆ دیتنی ماڵی خوا دەکەوێتەرێ.

پاشان هەر لەو زیارەت کردنەی ناگەرێتەوەو لە شاری (مەدینە) کۆچی دوایی دەکات و تەرمەکەی لە گۆرستانی (بقیع)دا سپاردە دەکرێت.

ئیتر بەو جۆرە هەموو ئاوات و خەونە پیرۆزەکانی لەگەڵ خۆیدا لەو ئاوارەیی یە دەباتە ژێر گلەووبە پەنهانی دەمێنەوە خوالێ خۆش بوو، برادەرییەکی زۆر پر لە دڵسۆزیو خۆشەویستی (دکتۆر) میرزا بەدیع بابا جان)(٨) بووەو پەیوەندییەکی (گیانیو رۆح)یشی لەگەڵ (مەحوی)(٩) شاعیردا هەبووەو هەڵاگیز بێ یەك هەر دەم هەڵیان نەکردوە. .

بێجگە لەوەش پەیرەوی رێبازی شیعری مەحوی کردوەو لە زۆری شیعرەکانیدا بە تایبەتی لە چامەکەدا (بەحری نوور) هەر بە ناوی چامەکەی مەحوییەوەناوەتەوە.(١٠)

دیارە ئێمەش لەم توێژینەوەمان دا تەنیا مەبەست بۆ ئەو چامەیەی شاعیرە. . ئەگینا تاوو توی کردن و توێژینەوە لە سەرجەم شیعرەکانی شاعیرو چوونە ناو دنیای شیعرەکانی شاعیرەوە کە زۆر لق و پۆپی لێ دەبێتەوە. . ئەوەندە شتێکی سووك و ئاسان نییەو زۆری دەوێت.

سەید ئەحمەد شیعرەکانی کلاسیکین و سەربەقوتابخانەی شیعرە کۆنە.

ئەمیش هەر وەك گشت شاعیرانی سەردەمەکەی شیعری بە زوبانی کوردیو عەرەبیو فاسیو تورکی ووتووە. . جا بۆ ئەو مەبەستە ئەگەر دەرفەت بوو. بە مەبەستی خزمەت گەیاندن هەندێ لە وێنەو بابەتی شیعری دەخەینە روو. . ئێستاش ئێوەو دەقی تەواوی (١١) چامەی (بەحری نووری)شاعیر، بە هیوای گەشەپێدان و بووژاندنەوەی کەلەپووری پر سوودی شیعری کوردی نازدارمان: -

**(چامەی بەحری نوور)**

**وصلی‌الله علی زاتێ کە قورئانی سەنا خوانە**
**لە جووملەی موعجیزاتی ئەوەل ئایاتی سوبحانە. . .**

**شەهنشاهی سەریری (لی مع الله) واسیتەی ئیمکان**
**رەسوولی ئینسیو جانە ئونسی جانە بەحری ئیحسانە. .**

**بە (بەدری) چۆن بکەم تەشبیە، کەنووری (م هـ) لەرۆژدەسکەوت**
**فەقەت (فخر الرسل) فەیزی لە نووری (حی‌منان)ە. .**

**سوموومی قەهری ماڵوێران، کوننەدەی میللەتی کوفرە**
**نەسیمی میهری زینەت بەخشی گوڵزاری موسڵمانە. .**

**بەنووری رۆژی روخساری شەوی کوفری جەهل گووم بوو**
**شەهی تەختی (لعمرك)مەسنەد ئارای مولکی عیرفانە.**

**شەوی میعراجی وەك سولجی هیدایەت پاك ونوورانی**
**شەوی بوو تاقیامەت سەد هەزاران رۆژی قوربانە**

**لە حوجرەی (أم هانی)دا خەولی کەوت بوو جووبریل.(١٢)**
**بە تەعجیل هات و فەرمووی مەرحەبا بۆ فەخری ئەکوانە.**

بوراقی بەرق ڕەفتاری کە بۆ هێنا سواری بوو
گەیشتە (مسجد الاقصی) ئەوەندەی نەسی قورئانە

کە تەشریفی دەچوو بۆ ئاسمان، مژدەی دەدا جووبریل
بە دەووری شەمعی ڕوخساری مەلائیك بونە پەروانە . .

هەتا حەزکا خودا بۆ مەقدەمی جەننەت دەرازێنێت
ئەوەندەی بێ بە دڵ دا، داری (طوبا)هاتە لەرزانە . . [13]

لە سەر بەحسی (أو أدنیٰ)دا، بڵێ چی بەندەی ئەدنیٰ
گەیشتە لا مکان و هاتەوە جێی خۆی هەر ئەو ئانە .

هەزار ئەندەر هەزار ئەسرارو ئاساری کرا تەعلیم
لە پەنجا نوێژەوە بۆی هاتە سەر ئەم پێنج فەرزانە[14]

بە چاوی سەر خودای بینی، بە بێ تەشبیە کەیفیەت
قسەی فەرموو لە گەڵیا، نەك بە حەرف و سەوتی خۆمانە[15]

چ بە حرێکی عەمیقە کوللی عەقڵێ تیا کولەو حەیران
چ بەحسێکی دەقیقە خاریجی تەوزیح و تبیانە . .

کەسێ چاوی بەکوحلی (مازاغ البصر) ڕێشڕرا
لە زوڵماتی قیامەت دا، بە حققەت چاوی لێمانە . . [16]

بە قوربانی موبارەك ناوی چاکی فەخری عالەم بم
کە ڕەوحی ڕۆحە، قوت و قوەتی دڵ نووری چاوانە . .

بە تەشریفی کە تاقی کیسرەوی شەق جێشی‌یێ شەق بوو[17]
ووشك بوو ئاوی سارا، مۆلکی فارس بوو بە وێرانە . .

سەر ئەنگوشتێکی ئیعجازی (یەدی)بەیفا)ی تیادەرجە
بە تەحقیق زیکری فەزڵی ئەو لە (وأنشق الـ)نومایانە .

کە سێ مەقبوڵی دەرگاهی ئەوە، ماقوولی دارەینە،
یەکێ مەتروودی ئەوبێ خرسە، خوگە بەڵگی شەیتانە . [18]

لەگەڵ قەهری ئەوا، باغی ئیرەم، وەك هاویە وایە
نەسیمی لوتف هەڵکا سەد کە دۆزەخ بێ گولستانە . [19]

لە وەسفی گەورەیی شاهی ڕەسوول، کول ماوە عەقلی کولل
چ سرێکە کە فیکری بیکری عارف، تیا هەرا سانە . . [20]

لە تەسبیحی حەسوو، ڕەقسی، شەجەر، هەم جوومڵەی أعجاز
ئەگەر شەرحی بکا شارح، دەبێتە سەد کوتوبخانە . . .

فەقەن (لولاك)کافی‌و وافی‌یە، بۆ هەرچی موئمین بێ
(لعمرك) هەم (عفی الله عنك)شافی ئەهلی ئیزعانە

لە شەرعی ئەنوەری (خیر البشر)هەر کەس کە مینقادە
لە سەر تەختی سەعادەت شەهر یارێکی حوکمڕانە

چ شەرعێکە شەوی وەك ڕۆژی ڕون و ڕۆژی هەروەك شەو
لە مینهاجی دەقایقیا موحەقیق مات و حەیرانە . .

هەزاران فەلسەفەو حیکمەت، فیدای‌یەك مەسئەلەی‌ئەوبێ
کە ئەو مەعمووری نووری حەق و ئەم وێران و بوتڵانە . .

ئەوەندەی تێ‌گەیشتووم من لەگەڵ بێ دیققەتی خۆما
کە شەمعی جەمعی ئەفلاکە ضیای چاوی ڕەسوولانە . .
بە لەحزە ڕووئیەتێکی دڵ وەکو ئاوێنە ڕووناکە
بەلەمحە سوحبەتێکی ئەو کەسە وەك شاهو سوڵتانە . .

فیدای چوار یاری چاکی بم، کە شەمعی مەجمەعی دینن
ئەبوو بەکر و عومەر، عوسمان و حەیدەر شێری یەزدانە . .

کەسێ لەم چوارە شەخسێکی نەوێ وەك ڕافزی بێ دین
گەلێ کەمتر لە سەگ، بەدتر لە خرس و خوگی کێوانە . . [21]

دەخیلەك یارە سووڵ الله عیلاجی‌حاڵی (ئەحمەد)کە
کەسەرگەردان وماڵوێران و غەرقی بە حری عیسیانە . .

به ڕووو وەك مەر هەژارە، باتینی وەك گورگی هارە . .
ماری خەتاكارە، نزارە، زارە، هەم بێزارە. حەیرانە . .

موولەوەس بوو، بە تۆزی مەعسیەت دامێنی تەمكینی
لە فیكری ئاخیرەت غافڵ، بە دنیا مەست و خەندانە . .

لەگەڵ ئەم بێ‌حەیای خۆم دا، عەرضیو نیازی من .
سەلاحی نەفسی ئیمانە، مەزیدەی عیلم و عیرفانە . . .

سەلاحی ئوممەتی ئێستە، كە زۆر دوون هیمەتن ئەغلەب
لە ناویان دا چی باسی حەشرونەشرو میزانە . . (22)

ئەنینو هەر مەحجەعیٚ ڕوو، كەسیٚ وا دێتە گوێی هۆشی
كەوا تەزویرو كیزبە، یاجنێوو فیسق و بووهتانە . .

وەلیٚ وەك خونچە مەخفیٚ ما، لە نێو پەردەی تەئەسووف دا
كە فاسیق ئێستە وەك گوڵ، بێ‌گومان بۆ بادە ئەفشانە . . .

مەلاوەك عەكسی خۆی لیٚ‌دابیٚ، دائیمامات ومەبهووتە
ئەلای هەر جاهیلیٚ ڕووكا، لەبەر سووكی پەشیمانە . . .

مەداریس هەر وەكو بایەقووشی تیا خوێندبیٚ خاڵین
لە باتی دەوورو تیكرار، ئێستەبستە، بستەلێدانە . . .

عەوامی قەریە ئەكسەر، ڕەهزەنن، یاقاتیلن یا دز
لە شارستان دا مەخمورە یا مائیل بە چایخانە . . .

بە كوللی باسی دین فەوتا، كەسیٚ بیكا بە لاساری
دەبێتە دوژمی عام و كە خاسیش لیٚی هەراسانە . .

لە دنیا ئەمرو نەهی‌كا، كەسیٚ لەم عەسرەدا بیٚ شك
دەڵێن : ئەو شەخسە پڕ تەزویرە، یا خۆشێتە دیوانە . .

بە جەهری ذاكیری زیكریٚ بكا، خەڵقی دەڵێن : شێتە
ڕیاكارە، نەزانە، ئەم هەرایە ئیشی شەیتانە . .

لە بۆ ئیسلاحی قەڵبی خۆی گەر بێتە سەرسری
سەری دەبڕن بە تیغی غەیبەت ڕیشی دەكەن شانە . .

لە كونجی وەحدەتا چاكیٚ بییٚ، دەیهێننە مەیدان
پەلاماری دەدەن، دەیخۆن وەكو هەنگوینی نێو شانە . .

بە حوورمەت ئەو زەواتەی دائیما مەقبوڵی دەرگاتن
كە خەرمانی هەواو لە زاتیان نەكریٚ بە یەك دانە . . .

لە ڕۆژێكا كە ڕۆژ بستیٚ، لە سەر دەووری هەموو ئەرزیٚ
دەبێتە ژێلەمۆو نامێنیٚ فیكری خوێش و بێگانە . .

لە تاوی تاوی زەفری ناوی دۆزەخ (تشخص الابصار)
لە هەوڵی بیمی مەحشەر دڵ وەكو جولانە لەرزانە . .

شەفیعی خۆم و ئەحبابم ببە (یاخیر خلق الله)
كە زۆر مەقبوڵ و هەم مەحبوبی عند الرب سوبحانە . .

هەتا ناوی شەریفت جیلوە بەخشە بۆ دڵ و هەم چاو
هەتا یادی دەكا تفرع، هەرچی ئەهلی ئیمانە . . .
لە سەحراداوە كو عابید هەتا نێرگس دەبیٚ ڕاكع
وەنەوەشە ساجیدو گەردن كەچی نێو باخ و بوستانە . .

هەتا لەم خاكەدا زدن لەگەڵ یەك ئاگرو هەم ئاوو
هەتا بادەی سەبا فراشی فەرشی نەو بەهارانە . .
هەتا شێخ سەوزە پۆشە، تا سنەوبەر زینەتی باخە
هەتا بوبول لە سەر چڵ بۆ جەمالی گوڵ غەزەلخوانە . . (23)

سەلات و هەم سەلامی لیٚ حساب و بیٚ‌حەدو پایان
لە سەر ئەو فەخری ئەرزو ئاسمان ئەو بەدری تابانە . .
لە سەر ئال و سەحابیو تا بیصینیان دەكەن ئینشا
وصلی الله علی زاتیٚ كە قورئانی سەنا خوانە . .

گوڵی گوڵزاری ئیحسانە. حەبیبی شاهی یەزدانە
دووری ئیجانی شاهانە خلیل الحق سوبحانە . . .

ئینجا ئەگەر سەرنجێ لەم چامەیەوگشت چامە ئاینی یە کوردی یەکانی کە بگرین[24] وعادیلانە شەن وکەووتاوو تووێو بەراووردێکی زانستانەورەوایانەوبێ چەندوچوون وبێ لایانەیان بکەین. . بێ یەك ودووکردن دەگەلینە ئەم سەر ئەنجامانەی لای خوارەوە. . کە پەرچ دەبێتەوە لە چوار چێوەی باری سەرنجم ورەنگە زۆر شتی تریش لەوجۆرە سەرنجانە مابن. . کە من هێشتا هەستم پێ نەکردبن ولام گرد نەبووبێتەوە: ـ

1 ـ شتێکی روون وئاشکرایە ناوەرۆك لە رێبازی شیعری کلاسیکی کوردیدا وەك یەکێتی بابەت (وحدة الموضوع) زۆر کزو کەم رەچاو دەبینرێت.

جا ئەوە لە قەسیدەیەکی چەند بەیتیدا، کە چەند وێنەو مەبەستی وەك شیعری دلداری، فەلسەفە، پەند. . هەتەد دەگرێتەوە نەخوازەلـلا لە چامەیەکی دوورودرێژی (100 ـ 150) بەیتیدا ئەبێ چۆن بێت. .

کە چی بە پێچەوانەی ئەوەوە هەموو چامە ئاینی یەکان ئەو دیاردەیەیان تیا وونەوسەرجەم یەکێتی بابەت یان تیا زاڵە. . چونکە هەر لە سەرەتای یەکەم بەیتی چامەکەوە تا کۆتای تەرخانکراوە. . بۆستایش کردنی پێغەمبەرو پیاهەڵدانی یارانیو باس کردنی میعراج وهەموو هەر ئەوشتە ئاینیانەی لە ئاقارو چەقی ئەو باسانەدا دەخولێتەوە. .

2 ـ ئەگەر سەرنجێکی ووردو قوڵ لە چامە ئاینی یە کوردی یەکان و بە تایبەت ئەوچامانەی بلاوکراونەتەوە. . ئەبینین چامەکانی (مەحویوخاکی) تەنانەت تا رادەیەکیش چامەکەی سەید ئەحمەد (کەمێ) لە چاوچامەکەی حاجی مەلا رەسوولی دێلێژەییدا (مخلص) دوورن لە تان وپۆو رەنگی خۆمالێتی یەوە. . ئەوەندەی زمان رەوانیو کوردی یەکی پەتیو جوان بە چامەکەی (مخلص)ەوە دیارە لەواندانیین.

دیارە هەموو هۆی ئەوەش دەگەرێتەوە، بۆئەوەی زمانیش لەگەڵ گۆرانی کۆمەڵدا لە گۆران کارییەکی سەرومردا دەبێت و دەچێتە باروو دۆخێکی ترەوە.

3 ـ بەڵام دەربارەی (تێلنیشان)[25] کە بەشێکە لە هونەری جوانکاریو شاعیران زۆر کەم لە شیعرەکان یان دا، هیما دەکەن بۆ ئایەتێکی قورئانی پیرۆز یان قسەیەکی بەرزی پێغەمبەران یان داستانێکی سەر سوورهێنەر یا رووداوێکی خوێناوی مێژووی یان ووتەیەکی نەستەق و پەندێکی ووردی پێشینیمان بە براوی من مەحوی زاناوبلیمەت زیاتر لەو شاعیرانە توانیوێتی لە چامەکەیدا (بەحری نوور) بە چاکی جێ دەستی خۆی لەورووەوە دیاری بکات وهەموو ئایەتە قورئانی یەکان یان ووتە پیرۆزەکانی پێغەمبەر لەولایەنەوە بە سەر یەك دا جۆش بدات و چامەکەی پێ برازێنێتەوە. . ئەوەتا بۆ نموونە دەڵێ: ـ

هەوا خواهی (عَلَیـه الرَّحمة والرضوان یان بۆما ئەعادییشی (علیه اللعنة)یە بەشیان و بەسیانە. . کەسێ ئایەی (عفا الله عنك)مەحضی دڵنەوایی بێ، (معاذ الله) دڵی ئەورەنجەکردن عەینسی خوسرانە. . یان کەسێکی وەکوخاکی هێژا بۆئەو مەبەستەی لێیدواین ل 446 دیوانی م هوی لەورووەوە دەڵێ: ـ

سەنای (یاسین)و (تاها)ی حەق لە سەر ئەوخاتەمە خەتمە بە هیچ کەس وەك ئەم ئەوناسە، نەکەس وەك ئەولەئەم زانە ئەمان (یاخیر خلق الله) دەخیل یا (ملجأ العاصین) لە بۆ ئیفلاحی خۆم عەرزت ئەکەم بەیتی فەلاحانە مەلاخاکی ل32.

بەڵام لەوبراوایەدام ئەم دیاردەیە وا بەوخەست وخوڵییە لە لای سەید ئەحمەدونەلای (مخلص)یش دەمێنێتەوە. . بگرە وێنەکان ووردە ووردە بەرەوکزبوون و کاڵ بوونەوە دەچن. ئەوەتا بۆ ئەو مەبەستە سەید ئەحمەد بەم جۆرە دەچێتە باسەکەوە: ـ

بە تووری رۆژی روخساری شەوی کوفری جەهل گووم بوو شەهی تەختی (لعمرك) مەسنەد ئارایی مۆلکی عیرفانە. . .

دیوانی دەست خەتی
شاعیر

یان ئەوەتا (مخلص) وا تێ هەڵچووە: : ـ

**هەموو زەراتی جیسمم لوجەی بەحری عیسیانە**
**لە دەست ئەم (نەفسە ئەممارە) عەجەب حاڵم پەریشانە. .**

**دیوانی دەست خەتی**
**شاعیر**

4 ـ چامـەی مەحـوی کە بریتی یە لە برە شیعرێکی (124) بەیتی و چامـەکـەی خاکی (150) بەیت و هەروەها چامەکەی سەیـد ئەحمـەد (56)[26] بەیت و (مخلص)یش چامـەکـەی بریتی یـە لە (63) بەیت. . هەرچـەنـدە من لە لایـەن خۆمەوە براوام بە زۆروکەمی و چەنـدێتی نی یـەو زیـاتـر لەو ڕووەوە حسـاب بۆ ناوەرۆکـێکـی بەرزو بابـەتی تازەو هەڵبـژاردنی مەبـەستێکی شیـاو دەکـەم بەڵام لەگـەڵ ئەوەش دا، ئەگـەر هێڵێکی بەیـانی بەوپێـوانەیە بۆ پشوو نەفەس درێژ ی شاعیران بکێشین. . دەبینین خاکی شاعیر لە لووتکەدایەو دیارە ئەمەش زۆرتـر نەفـەس دێژ ی شاعیر لە چاو ئەو شاعیرانەدا لەو ڕووەوە دەخاتە ڕوو.

5 ـ بەڵام دەربارەی چەند ووردە سەرنجێکی تر، وەك زۆر، لە خۆکـردن بۆ رازانـدنـەوەی چامـەکـان یان گرنگی بە ڕەوان بێـژ ی و یاری کـردن بە ووشـەو جوونەوەو تکرارکاری و بە قووڵی نەچوونە ناو دنیایی تەسەوف و دوورکەوتنەوەو نزیك بوونەوە لە مەسـەلـەکـە دیـارە شاعیران هەندێکیان لە چاو بەشەکەی تریا نەگەیشتوونەتە پۆیەو لەو ڕووەوە کەڵێن و لەنگی و کەلەبەریان تێ کەوتووە.

لە کۆتـایی دا: ـ دەڵێم هەمـووچامـەکـان ووردن و پڕن لە سنعـەت کاری و لە بەرزی دا بێ وێنەو جوانن بەرای من بەردی بینـاغـەی چامـەکـان. چامەکەی مەحوی یەو شاعیرانی دوای ئەویش. . لە بەردی بینـاغـەی ئەو باسـەیـان هەڵسـانـدووە و بە هەمـووان منـارەیـەکی باڵانمـایی یـان بەرزکردۆتەوەو جێگایی شایستەی خۆی یان لە مێژ وو ئەوەبی کوردی نازداردا گرتووە.

منیش هیوام زۆرە لەو لایەنەوە توانیبێتم خزمەتێکی پچوکم بە خوێنـەران کردبێت و گەرچی بۆ قەدەرێکش بێت مێشکی ماندوو بوویانم تۆزێ حەوانبێتەوە. ئیتر سوپاس.

**پەراوێزەکان: ـ**

1 ـ سەیـد ئەحمـەد، چۆن شاعیرێکی گەورەبوە هەروەهاش بێ ڕیـاو غەلـەو غەش بووە. . بە مووتەسەوفێکی کامڵ و تەواو ناسـراوە. . ئەوەتـا بێ ڕیـا رووی دەمی دەکـاتـە سەرجـەم دەروێشەکانی و پێ یان دەڵێت: ـ

تەریقـەی قادری و تەقشبەندی هەردوو ڕێگای حەقن
عیلاجی قەلبی قەڵبت کە چی لەم لابێ و چی لەو لابێ.

واتـە: ئەگەر لە خواترس و خواناسێکی تەواوی، تەریقەت کە ڕێگـای عیبادەتە، بۆ گەیاندنە مەنزلی ڕووناکیران و نووری هەق. . هیـچ جیاوازی یەکی نی یە بۆ تیماری دڵی پڕ لە غەلەو غەشت چ لەم لا بێ و چ لەو لا بێ. .

2 ـ ئەم شاعیرە ناودارە، کە پلەی لێ هاتووی و بەهرەداری هیچ لە شاعیـرانی هاوچـەرخی خۆی کەمتـر نی یە. . تا ئێستا وەك پێـویـسـت هەقـی شیـاوی خۆی پـێ نـەدراوەو لەلایـەن لێکۆڵەرەوانەوە ژێر لێو خراوە. .

تەنـانەت مامۆستا سووجادی لە باخچەی شاعیرانی مێژ وو ئەدەبـی کوردی دا کە سەرپێ ی ناوی دەبـات، مێـژ ووی لە دایك بوون و کۆچی دوایی لە جیاتی ساڵی (1860 ـ 1927) بە ساڵـی (1863 ـ 1909) دادە نێـت و هەروەهـاش نووسینـەکـەی کاك ئەسعەد عەدۆش لە پیناسی بە شێکی تری شاعیران دا ئەوەندە نی یە تاسەو تینیوێتی خوێتەرانی پێ بشکێت.

3 ـ گڵە زەردە گونـدێکی رازاوەو خنجیـلانـەیـە، بە چەنـد کیلۆمەتریك کەوتۆتە خوارووی شاری سلێمانی یەوە. گوندەکە بە سەر هەموو دەشتی شارەزوو روو سلێمانی دا دەروانێت.

لەم گونـدەدا چەنـدان عالـم و زانـایـی گەورەی تیـا هەڵکـەوتـووە. . یەکێـك لەوزانـایـانـە (شێخ حەسـەنی گڵەزەردە)یـە کە دەبێتـە برای شێخ مارفی نودیێ ی (1753 ـ 1837). . ئەم زانـایـە دەستێکی باڵای هەبـوو لە عیلمی (فەلەکیات)و زانستی (جوغرافیا)و (ماتماتیك) زانێکی تەواوبووە.

4 ـ سادات لە ناوچەی سلیمانی دا دەبن بە دوو لقەوە: ـ

ساداتـی باراوی و ساداتـی بەرزنـجـە. . . لە ساداتـی بەرزنجـەیی دا بێ لەکـەڵـە پیـاوێکی وەکـو (سەید ئەحمەدی نەقیب) چەنـدان گەورە پیـاوانی وەك: ـ «شێخ تەهای گەورەو سەیـد عەبـدول کەریمی بەرزنجـەیی و زاتێکی وەك شێـخ موحـەمـەدو شێـخ مارفی نۆدێی و حاجی کاك ئەحمـەدی شێخ (1793 ـ 1889)و شێـخ حەسـێـنـی قازی (1785 ـ 1865)کە مامی شاعیرە تیا هەلکەوتووە.

شێخ رەئـوفی نەقیب دەگێـڕێتەوە، جارێکیان حاجی کاك ئەحمەدو شێخ حەسێنی قازی خوشکەزای دەچنە بەغداد. .

کاتێ هەستیـاروزانـایی عەرەبی (عبـدالباقي العمري) کە ئەو ساتــە (رئیس العلمـا)ی شاری بەغـداد دەبێت، هەواڵی

هاتنی ئەوزاتانە دەبیستێت.
خێرا دەچێتە خزمەتیان ورووی دەمی دەکاتە قازیو دەفەرمووێ شرّف بغداد کما شرّف العرش بنعلی جدك الاعلیٰ شێخ حسێنیش یەکسەر بەم جۆرە وەڵامی دەداتەوە: ـ
جسمی بجمیعه بحق الباقي في حُب غدا منازل الاشواقِ.
أما خدری فقد غدا ذا لهب من فرقتكم فكیف حالُ الباقی؟
ئەم زاتە بلیمەتە چۆن شاعیرێکی بێ هاوتا بووە هەروەهاش نووسەرێکی بەرزوچەندان پەخشانی کوردی وەك مەولوود نامەی هەیە. کە بە یەکەم پەخشانی کوردی دەژمێرێت.
5 ـ شێخ مستەفای موفتی، براگەورەی شێخ موحەمەدی موفتی بووە. کە مەشهورە بە (موفتی کەرە). موفتی کەرە زۆر مەحسووب و مەنسووبی مەحوی بووە. هەرچەندە گەلێ لە پیاوانی شێخان ئەم نزیك بوونەوەیان لە مەحوی پێ ناخۆشی بووە بەلام ئەو لەگەڵ ئەوەش دا پێ ی هەر لە مەحوی نەبریوە بە ئاشکراو بەنهێنی سەرومر هاتووچۆی کردوە تەنانەت لە هاتووچۆیەکی دا مەحوی دەڵێ: ـ
رێ ی خستە خەستەخانەکە یاری خەجستە پەی جێ ی چاوەزارە (مەحوی) ئەم ئەسرارە دەرنەخەی سایەی هومای باڵی ئەوبوو کەوتە سەر سەرم دوایێنی هەوری رەحمە (موفتی) لە دەست نەدەی...
6 ـ شێخ رەئووفی سەید نوری نەقیب دەگێرێتەوە و دەڵێ: ـ
لە دەووروبەری ساڵەکانی (1919 ـ 1920) کاتێ ئینگلیزەکان هاتنە سلێمانی یەوە. دەستیان بە سەر زۆر شوێن و شت داگرت: ـ
یەکیك لەو شتانە بەرهەمەکانی خوالێ خۆش بوو سەید ئەحمەد بوو. تەنانەت بێ مروەتانە پەراوخانە بە نرخەکەش، بەرهێرش تالان و سووتاندن کەوت.
هەرەهاش مامۆستا کاکەی فەللاح لەو رووەوە پێ ی وا بوو کتێبخانە بە ناونگەکەی شاعیریش (حەمەدی ساحێبقران) ئەویش هەر بەر ئەو تالان و سووتاندنە دەکەوێت و یەکەم دیوانی شاعیریش لەو سوتاندنەدا لە کیس چووە..
7 ـ مزگەوتی سەید ئەحمەد نەقیب، ئێشتا پێ شیدەڵێن مزگەوتی ئەوقاف.. بە هۆی ئەوەوە کە دەکەوتە پشت دائرەی ئەوقافەوە ئێستا ئەم مزگەوتە لە ناوجەرگەی شاردایەو کاتی خۆی جێنزرگەی پیاوچاکان و شوێنی وەعزو ئیرشاد خوالێ خۆش بوو بووە.
8 ـ دکتۆر میرزا بەدیع باباجان، خەڵقی سنەیەو هاتۆتە سلێمانی یەوە.. بە هۆی ژن وژنخوازەوە، پەیوەندی لەگەڵ بنەماڵەی شێخان دا پەیدادەکات.
ئەم زاتە شیعی مەزهەب بووەو بێ لە زوبانی کوردی مەشهوریش بووە بە فارسی زانێکی باش. ئەدەب دۆست و قسەرەوان و نەستەق بووە..
دەربارەی ئەم پیاوە کاك ئەسعەد عەدۆ لە پەراوی پێناسی بە شێکی تری شاعیران دا.. هەرئەوەندە دەڵێ گوایە زۆر دۆستی سەید ئەحمەد بووە ئیتر بێ لەوە هیچ شتێکی کە لەو رووەوە نادرکێنێت.
9 ـ مەحویش یەکێك بووە لە دۆستە دڵسۆزو وەفادارەکانی شاعیر لەگەڵ ئەوەی شێخان ئەم هاورێیەتی یان لەلا گران بووە.. کە چی زۆر جار سەید ئەحمەد بە روویان دا تەقیوەتەوەو پێ ی وتوون: ـ
(دەستم پێ لە ئێوە هەڵئەگیرێت، بەلام هەرگیز دەستم لە مەحوی پێ هەڵناگیرێت..).
جا بۆ ئەومەبەستە، مەحوی، سەید ئەحمەدی خۆشەویستی بەم جۆرە دەلاوێنێتەوەو دەفەرمووێ: ـ

**پەروازی جانە رۆینی جانانە بۆچ**
**تۆ گۆرەوی لە پێ دەکەی و من لە دەست دەچم**
**هەستانیت ئەرقیامی قیامەت نی یە چیە**
**بێ دەخلی چەنگ و نەی ومەی لە مەست دەچم**
**دیوانی مەحوی ل**

هەروەهاش خوالێ خۆش بوو دەربارەی لە دنیا دەرچوونی مەحوی هاورێیەوە بەم چەند شیعرە ئەویش دڵسۆزی خۆی دەردەخات کە ئەمە سەرەتای شیعرەکەیە: ـ

**ئەوا یاران هەموو رۆیین، بە بێ جێ من بە جێ ماوم**
**دڵم رەش رەنگ و رووزەرد، سپی بوو دیدەکەم چاوم**

**شەرابی کەئس دنیا وا دەماغ و کەللەمی پر کرد**
**لەبەر مەستی سستی، من هەمیشە کاس و تاساوم**
**دیوانی مەحوی 55**

10 ـ ئەبنین هەمـوو چامـە کوردی‌یـەکـان و چامـەکەی سەید ئەحـمـەدیش هەر بەڕناوی چامـەی (بـەحـری نووری) مەحوی‌یەوە ناو نراوەتەوە.

ئەوە لە لایـە، لە لایـەکی کـەشـەوە، هەنـدێ لە خاوەن چامەکان ڕاستەو خۆ لە چامەکانیان دا ناوی مەحوی‌یان هێناوە یان هەر هیچیـان نەکـردبێت کوت و مت شوێن پێ‌ی ئەویـان هەڵگـرتـوّتـەوە. . ئەوەتـا کەسـانێکی وەکـو سەید ئەحمەد بۆ ڕاسـتی قسـە بەم جۆرە شوێن ڕێبـازی شیعـری مەحـوی کەوتوّتەوە: ـ

مەحوی دەڵێ: ـ

ئەوەنـدەی لێ‌دەزانم بەم نەزانی خۆمـەوە مەحوی بە چاوی سەرخودابینە بە چاوی دڵ خودازانە. .

سەید دەڵێ: ـ

ئەوەنـدەی تێ گەیشتـووم من لەگـەڵ بێ دیققەتی خۆما کە شەمعی جەمعی ئەفلاکە، ضیای چاوی ڕەسوولانە.

مەحوی دەڵێ: ـ

بەدی بەیضـا چیـە هەر تاقـە ئەنگوشتێکی چەند ئیعجا زی لێ‌زاهیر بووە، هەریەك وەکو ماهی تابانە. .

سەید دەڵێ: ـ

سەر ئەنگـوشتێکی ئیعجـازی یەدی بەیضـای تیـا (دەرجـە بە تەحقیق زیکری فە زڵی ئەولە (وأنشق الـ) نومایانە.

مەحوی دەڵێ: ـ

چ چاوێ کوحـای (مـاذاغ البصـر) سوورمەی سەوادی لێ موونەوەر بێ بە نووری ڕوئیە بێ چوون و چەندانە.

سەید دەڵێ: ـ

کەسێ چاوی بە کوحلی (ماذاغ البصر) ڕێژ را لە زوڵماتی قیامەت دا بە حققەت چاوی لێمانە. .

دیـارە ئەمـە چەنـد نمـوونـەیـەکی کەمـەو (مشتێ) لە خەرواریکـەو ئەگـەر بە ووردی سەرنجێ لە سەرجـەم چامەکە بگرین زۆر لەو دیمەنانە دەبنین بە ئاشکرای‌و ڕوونی‌یەکی تەواوە. .

11 ـ هەمـوو چامـە کوردی‌یـەکـان لای (شێـخ موحـەمـەدی مەحوی ئامۆزام هەن و نییەت وایە هەموویان لە پەراوێك دا کۆ بکاتەوەو بە چاپی‌یان بگەیەنێت.

دیارە ئەو پرۆژەیەشی بۆکارێکی وەها ڕەنگە زۆری بوێت و بەم دەمودەستە نەیەتەدی. .

بۆیە منیش لە لایەن خۆمەوە وەك دەست پێشکەری‌یەك ئەم چامـەیـەم لێ‌سـەندو روخسەتی بلاوکردنەوە لێ خواست زۆر سوپاس دەکەم.

12 ـ أم هانی: ـ پووری پێغەمبەر بووە.

13 ـ دوودا هەن، داری زەرقووم کە لە دۆزەخ دایەو مەشهورە بە دارێکی ناشیرین و ڕێکی تفت و تاڵی هەیە. . بەڵام داری تووبا دارێکی بەهەشتی‌یەو بەژ ن و باڵاریك و بەرزە سەرەرای ئەوەش بە ڕێکی شیـرین و خۆشی هەیـەو هەرگیـز مرۆڤ لە خواردنی تێر نابێت.

14 ـ ئەوە بوو لە ئاکـامی شەفـاعـەتی پێغـەمبەر بۆ ئیسلام خوا شەفـاعـەتی لێ‌قـوبـوڵ کردو لەوەوپێش کە پێـویسـت وابـوو موسـوڵمـانان پەنجا نوێژ لە ڕۆژ یك دا بکەن لە خۆشەویستی‌و پارانـەوەی ئەو زاتـە هاتە سەر (پێنج) فەرزەی نوێژ ی بەیانیان و نیوەرۆ و عەسرو ئێوارەو خەوتنان.

15 ـ لەو ڕووەوە مەحوی دەفەرمووێ: ـ

کەلیـم (أرنـی) کە فەرمـوو جەوابـی (لـن ترانـی)ی دی مووشـەرڕەف بوو محمـد بێ تەلـەب بەومەرتـەب و شانـە خاکیش وا دەڵێ: ـ

**(أرنی)و (لن ترانی) با نەڵێت و نەشنەوێ مووسا**
**بە سائیل نادرێ ئاخر ئەوەی دەرخواردی میوانە**

16 ـ واتە پێغەمبەر هەر لە ئەزەل دا چاوی کل ڕێژ ی خوایی‌یەو ئینـجـا کە سێـلك بەوجۆرەبێت. . چۆن لە تاریکی ڕۆژ ی حەشـردا کە ڕۆژ ێکی پڕ دەردەسـەری‌و ئۆف و ئاخە. . چاوی ڕێشکـەو بێشکـە دەکـات و ئەو پێغـەمـەر نازدارە چاوی سۆزو پارانەوەی لە ئومەتی خۆیەوە نابێت.

17 ـ جێش پێ شەق بوو. لام وا بێـت ڕاستیکـەی ئەوە بێت (جێشی پێ لەق بوو.

18 ـ ماقوولی دارەینە: ـ ماقوولی دنیاو قیامەتە.

19 ـ وەك هاویە وایە : ـ وەك دۆزەخ وایە . .
20 ـ كول ماوە : ـ سەرسام ماوە . . یان كول تیژ ییە عەقلی كولل : ـ عەقلی گشت : ـ عەقلی هەموان .
21 ـ خرس : ـ بە یكێك دەڵێن لە تەمەڵی و تەوەزەلی دا خرس دایگرتبێت و توانای جم و جۆڵی نەبێت .
خوگە : ـ بەرازە
راقری : ـ بە یەكێك دەووترێت لە لێ ئیمانی دا بروایی بە هیچ نەبێت و سۆزو بەزەلی لە دڵ دا هەڵگیرابێت .
22 ـ دوون هیمەت : ـ مەبەست لە هیمەت نزمی و دەنی هیمەتە .
23 ـ هەتـا شێـخ سەوزە پۆشـە : ـ هەتـا شێـخ غەرقەی سەوز دەپـۆشێت . . چونكـە كۆن شێخی تەریقەت هەر دەم لە كاتی زیكـر و تەهلیلەدا غەرقـەی سەوزی دەپـۆشی تا كاتی زیكـرو تەهلیلەدا ، غەرقەی سەوزی دەپۆشی تا بەو دیمەنە خەڵكی لە مووریدو دەروێشەكانی جیابكەنەوە .
24 ـ چامـەكـەی مەحـوی مامـۆستـا عەبدوڵكەریم مودەریس لێ ی تـوێـژ یـوەتـەوە و چامـەكەی خاكیش مامۆستا خاڵ لێ ی كۆڵیـوەتـەوە . . ئیتـر ئەو دووزاتـە بە هیـچ كلۆجێـك تەنیـا ئیشـارەتێـك چی یـە بۆ چامەكانی مامۆستایان (سەید ئەحمەدو مخلص) چی یە نەیان كردوە . .

جا بە بروایـی من هەق وایـە هەر نووسـەرێـك لە سەر هەركـامێ لەو چامـانـە دەنـووسێت پەنجـە بۆ هەموو چامەكان زۆرو كەم پەیوەندیيان بە یەكەوە هەیە .
25 ـ تێلنیشان : ـ مەبەست لە ئیشارەت دان و بەنجەراكێشانە بۆ یەكێك لەو مەبەستانەی لێ ی دواین .
26 ـ بۆ پاكـژ كـردن و ساخكردنەوەو رێك حستن و بژاركردنی ئەم چامـەیـەو گشت شیعـرەكـانی خوالێ خـۆش بوو سەیـد ئەحمـەدی نەقیب . . وەك من پێ بـزانم (دیوانی شاعیر) گەلێ دەستـاو دەستی كردوەو دوا جار مامـۆستـایـانیش (نـەجمەدین مەلاو شاعیر عەلی باپیر ئاغاو كاكەی فەللاح و محەمەد مستەفا كوردی لەو رووەوە بە مەبەستی دیوانێكی پاك و پوختەو رەوانی شاعیـر . . . گەلێ رەنـج و هەوڵی دڵسـۆزانـەیـان داوەو تا بەرەنجی هەموان شیعرەكا نیان خستۆتە سەر شێوەی رێنووس و ئیمـلای كوردی ئیمـرۆ . . ئێستـا دیوانەكە ئامادەیە بۆ چاپ و چاوەروانی دام و دەزگـایـەكی رۆشنبیـری كوردی یـە . . تا ئەو ئەركە پیرۆزە بخاتە ئەستۆ .
دوا ووتە سوپاسی بۆ هەموو لایەك ، بە تایبەتی مامۆستایان (شێـخ رەئـووفی نەقیب و شێخ محمدی مەحوی) . . كە زۆر لایەنی لێڵ و شاراوەی شاعیریان بۆ روون كردمەوە . .

تێبنی : ـ
سەیـدا أنـور محمـد طاهـری چیرۆكەك بناڤێ ـ راڤەشێر ـ لگـوڤـارا ـ بەیـان ـ دا ژمـارە (96) بەلاڤ كربۆ . . لێ مخابن هنـدەك ژ دویماهیا چیروكێ ل چاپخانێ كەتبۆ هیڤی داین سەیدا انورو خویندەوارێت هێژا ل مە نەگرن .

# شه‌نگستین «موسیقی»ی ل ده‌ف هۆزانڤانێت كورد

ئه‌حمه‌د قه‌ره‌نی

هۆزان ئه‌و كچا جوان ، دلبه‌را بێ گوناه و بوهتان ، ئاڤه ل سه‌ر ده‌ڤێ تێهنیان ، بایه ل ناڤ سیهێت زارۆكان خۆهه ل سه‌ر ئه‌نیا ره‌نجبه‌ران خوینه ل ناڤ ره‌هێت شوره شگێرانْ . .

له‌وما ئاڤ و با ژ یَدەرێت خۆه و خوینێ نه و خۆه و خوین ژ ژێده‌رێن كارێت مه‌زنه . . هۆسا زنجیرا كار وكریارێن مه‌زن دبیته دیرۆك ، دیرۆكێ قوناخ هه‌نه هه‌ر قوناخه‌كێ ده‌م وده‌لیڤێت ئاشكرا هه‌نه بۆیه ئه‌و ده‌مێ رویدانه‌كا باش و مه‌زن تۆمار نه‌كه‌ت ناهێت هژمارتن ژ ژینا مللەتی (1)، به‌لكو دبیته زیان وكۆسپ درێكا كاروانێ پیرۆزدا چونكه جوانیا خاكێ ب تنێ نابیته پێشكه‌فتنا ماكێ ل دنێ .

له‌ورا چو جاران هۆزانا كوردی هند بێ ده‌ست هه‌لات و ته‌سك نه‌بوویه كو ل به‌ر ئاوازێت ژێنی سترانا نه‌لورینت ئان نوی ئه‌زمۆنا نه‌ڤه گریت وهزر و بیرێت هه‌ڤ چه‌رخ نه‌هه‌لده‌ت و نه‌ده‌ر هینێت مینا هۆزانڤانێ مه‌زن ئه‌حمه‌دێ خانێ ئه‌ڤ بۆشایه پركری وباخچێ ڤالاتیا جاخێ خۆب كولیلك و خونچێت چیرۆكا (مه‌م وزین)ێ خه‌ملاندین . . هه‌روه‌كو دئه‌ڤان مالكاندا خۆیا و ئاشكرا دبیت :

خانی ژ كمالێ بی كمالی .

مه‌یدانێ كمالی دیت خالی .

یعنی نه ژ قابیلی ژ خه‌بیری .

به‌لكی تعصبی عشیری .

ئه‌خوار دور دی .

مانه‌ندی دوری لسانی كوردی .

اینایه نظام و انتظامێ .

كێشایه جه‌فا ژ بۆی وێ عامێ .

داخه‌لق نه‌بێژیتن كو اكرادْ .

بێ معرفتن بێ اصل و بنیاد (2) .

هه‌روه‌سا مه‌لایێ جزیری ب ته‌فشێ (خویه‌تی)ێ ودرناسیێ دارێ لاندكا هۆزانا كوردی تراشی‌یه :

مه‌را ژ اول چه به‌ر خامی كشاند آخر به به‌دنامی .
ژ ره‌نگی سه‌عدی وجامی ژ شوهره‌ت پێ حه‌سین عامی .
ب ده‌نگه وبانگه وئاوازی ، دبێژیت نه‌غمه یا سازی .
لانهان كی‌ماند آن رازی كزو سازند محفلها .
ژ حافظ قوطبی شیرازی ، مولا فه‌هم ئه‌ربكی رازی .

ب ئاوازی نەی وسازی ،ب بەی بەر چەرخی پەروازی (3).

دیسان (نالیٚ) تەنگ وقەیاس گریٚدایـنە وسەر بهارڤە دناڤ بەفرو کزە باومـژ و مورانیٚ مینـا رەڤەندو کوچەران بەرەڤ ژیٚهەل چوویەو قەستا زۆران وکـویستـانیٚت زمـانیٚ کوردی کریـە ،لـەورا ژ ریٚبـازا خوەرا گووتی‌یە :

تەبعی شەککەر باری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا .

ئیمتیحانی خۆیە مەقسوودی لەم عەم دا وا دەکا .

یا لە مەیدانی فەساحەت دا بەمیسلی شەهسووار .

بیٚ تەئەممول بۆ هەموو نەوعە زمانیٚ را دەکا .

کەس بە ئەلفازم نەلیٚ خۆ کوردی‌یە خۆ کوردی‌یە .

هەر کەسیٚ نادان نەبیٚ خۆی تالیبی مەعنا دەکا (4).

ئەو قوناخا بەرهەمی بەرچاڤ تیٚدا هەبیت نیشان و بەلگەیا جوامیری وهنیٚـرا هۆزانڤـانیٚت کوردە دژی نەمانیٚ . و ئەگەر قوناخەك بوری‌یە چوبـەرهـەم تیٚـدا بەرچـاڤ نەبوینە . . هزار ریٚك و دەریٚت گوهدیٚر هەبوینە (5). . .

لەوما نالبەند مینا شیٚران نری‌یە دەمیٚ دبیٚژیت :ـ

ئەزم شاعر ئەزم ئاگر ئەزم شیٚر .

دگاڤیٚ دای برم دارا رەق وپوت (6).

هۆسـا هۆزانڤـانیٚ نیشتمـان پەروەر مینـا شۆرەشڤـانـەکیٚ ئازریای و خەمخۆرەکیٚ دلدار کاروانیٚ هۆزانا کوردی ددەتە ریٚکیٚ وخۆ قوربان وگوری ئەویٚ ئەگەریٚ دکەت . هەر دئاسۆیا ئەڤیٚ ئومیٚدیٚ دا لورکا دبیٚژیت «پیٚتڤی‌یە هۆزانڤان رەهـ ودەماریٚن خوینا خۆب ڤەبریتن ژ پیٚناڤا کەسیٚن دی»(7).

هۆزان ڤەهاندن کارەکیٚ ساناهی نیە ،بەلکو کارزان وشەهرەزایا مرۆڤی‌یە دگەل هەموو ئالیٚت ژینیٚ ،لەوما مەلایی جزیری مینا تاییٚ ریٚڤـازیٚ سەریٚ خۆدنـاف بەر وخیـزەلانکـان هەلـداوشیـا خوانـدنگـەهەکا تایبەت ب دامەزرینیت ول دویڤ زانین و تیژ بیریا (خـۆیـەتی) توانی بەریٚ پاپۆرا هۆزانیٚ ب وەرگیٚـریٚت و کاروانیٚ پیرۆز ب گەهینتە ئادا دیرۆکامەزن ،وکوردان ئاگاهـ بکەت کو ئەڤ ئادە نوی وارە ژ زۆرانیٚت کوردستـانیٚ . . . جزیـری ئەڤیٚ سریٚمیٚ ئاشکرا وخۆیا دکەت و دفەرمووت :

گەر لوئلولیٚ مەنثور ژ نەظمیٚ تو دخوازی .

وەر شعریٚ مەلیٚ بین تە ب شیرازی چ حاجەت (8).

یان دەمیٚ دبیٚژیت :

ب حەق رندیٚ خەراباتم ژ دیٚریٚ ڤی دەمی هاتم .

چ هیڤی هۆن دکن ئیرۆ ژڤی رندیٚ خەراباتیٚ .

دعشقیٚ پشیٚخیٚ ثانی مە ب دل بەحریٚ مەعانی‌مە .

(لذی حجرو ذی قلب شفاءفی اشاراتی).

دئقلیمیٚ سوخەن میرم دشعریٚ دە جەهانگیرم .

(ویعلو موکب العشاق اعلامی و راياتی).

کوردان ئەڤ قەنجی و چاکی وخـزمـەتـە ژ منەت و بارگرانی‌یە ژ بەر بارو پیرۆز خەلات و دیاری‌یە .

هۆسا سەیدایی (رحیم رحمی هەکاری) نەمرنا جزیری ل بوهارا عشقیٚ میٚهڤان دکەت ودبیٚژیت :

کرمانج دڤیٚ هەر دەم فەخریٚ ب تەکن الحق .

لاکن تو کو مەنصوری رتباتەبو (انا الحق)(9) .

هۆزان نەرایـەخـا بویـك وزاڤـایانە ،بەلکو هیٚڤیٚنیٚ ئەڤینیا دوو دلا نە هۆزان نەخوارنا رافکەرایە ،بەلکو دەنگ وهۆرمیٚنا تڤەنگا نیچیرڤانایە هۆزان نەکەپەنەو نڤیٚژا دیٚرایە ،بەلکو بانگ وئاوازا بلویر و زەنگلایە .

هۆزان سترانەکا زیندی ونەمرە کەسیٚ دڤەهینیت نامریت وزمانیٚ پیٚ هاتیـە گووتن هەریٚ ساخـە لەومـا ناڤیٚ هۆزانڤـانیٚت کورد هەتا نوکـە پیٚ لنـاف خوینـا مەدا دزڤـریت . . مینـا خانی ئەڤ ئەگـەرە

دەست نیشانەکری (10).

گەردیٚ هەبویا مە ژی خودانەك .

عالی کەرەمەك لەطیفە دانەك .

من دیٚ عەلەما کەلامیٚ مەوزون .

عالی بکرا ل بانیٚ گەردون .

بیناڤە رحا مەلیٚ جزیری .

پیٚ حەی بکرا عەلی حریری .

کەیفەك وە بدا فەقیهیٚ تەیران .

حەتتا ب ئەبەد بمایە حەیران (11).

**پشتی چکین و چەسپـانـدنـا شەنگستیٚت (خـویـەتی)یٚ لدەف هۆزانڤـانیٚ کورد خۆیـا و ئاشکـرا بین یافەر و پیٚتڤی‌یە پەیـسکیٚت (خویەتی)یٚ بەرچاڤ بکەین کو ژ چوار ستوینا پیٚك هاتیە :**

- 1 -

هەست پێ کرنـا خەم وژان ودەردێن مللەتی‌نــە و پشکـداریـا راستەخۆ دگـەل داکـەفتن و داچوونا کومەلیە ، پاش هەڤبەندکرنا ئەڤــان خالێن بەرز و خەلاتێن ژیهــاتی‌یــە ب خوینـدنگــەهــا سروشتی‌ڤـە . . ژپێنـاڤا دەرچوون و پەیدابوونا هێزەکا بزافکەر کو بکـاریت (بشێت سۆزو هیڤی و ئومێـدێن قازانجا سەرەکی تێدا ب جهـ بنییت مینا هۆزانڤانی فرەنگی )دی موسسیە) دبێژیت :

(چو تشت مە بلندو مەزن ناکەت ژ بلی ژانەکا مەزن)(12) .

ئەز ژ دبـژم ئەگـەر خەم و هیڤی نەبـان هۆزان نەدبـوو . . . لەومـا هۆزانڤـانێت کوردان ژ بەر خەم وژانێت گران هۆزان ڤەهـانـدی‌نە . بۆ نموونە ئەڤان چەند مالکان دێ کەینە نیشان وبەلگە . . .

مەلایێ جزیری دبێژیت :

ژ کوفانا تە شرینێ .
دنالم شوبهی گوییێ .
دریژم هێسترێن خوینێ .
وەکی طافی دبارانێ (13)

و(بێ‌کەسی)ژ کویراتیا دلەکێ پر خەم و کوڤان گووتی‌یە :

ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیر کەوتەوە .
وەختی بەندی یو ئەسارەت ، بێ بە تەوق و کۆتەوە .
من لە زیکرو فیکری تۆ غافل نەبووم واتێ نەکەی .
حەپس و تێ هەڵدان و زیللەت تۆی لەبیر بردوتەوە (14) .

وپەرتو)ی هەکاری گووتی‌یە :

وەکی من قەت کەسەك ژارو پەریشان هەرنەبت یارەب .
ئەسیرو دەردداری داغێ هجرانێ هەر نەبت یارەب (15) .

(خـانی) ژ بەر خەمـەکا گران ونێشەکا تژی ژان وبرینەکا ب کوڤان گووتی‌یە :

ئاخێ دکر ئاخ وبەر دنالین .
داران دکر ئاه وبەلگ دگالین (16) .

ژان وخـەم ژێـدەرێت سەرەکی نەبیو خویندنگرها هۆزانا کوردی یا تایبەت ب گۆرانێ‌ڤە :

دەگریم و دەسووتێنم هەر وەکو مۆم .
ئاهم نەگاتە گۆشی گەردوون .
مات و کزو مەلوول و مەحزوون .
بۆحالی غەریبی ، بێ‌کەسی خۆم ! . . . . (17)

دیسان فەقێ تەیران ژ بەر دەردو ژانان کەڤانا بەلنگازێی ژەنی‌یە :

قەوی ئیرۆ زەعیف حالم .
دنالم ئەز لوێ دایێ .
دبر هانان دهات فالم .
طلسما وە صلەتا نایێ (18) .

د ئەڤــان چەنـد مالکێن سلالـدا دیـار دبیت کو خەم و ئێش وژان و کوڤــان و کەســەر وبێ کەسی و هەژاری بنگـەهێت خۆیـەتیـا هۆزانڤانێت کوردە دەمی بەرهەمێت ئەوان دبنە چراو هندەك رێکێت نوی پێ روهن دبن وئەو رێك دبنە شانازیەك بوو پێشکەفتنا گشتی و بەرەف زانینەکا فرەوانتر . . .

لەومـا (ئـەلبیـرکـامـۆ)ی هژاری کریـە خویندنگەهـ و مامۆستا گەلـەك زانست و سنج و نەریت ژێ وەرگـرتینـە و فێـری رەوشت وکـارێن قەنـج و بلنـد بوویە هەر وەکو دبێژیت (من سەربەستی ل مارکـسی نەگرتی‌یە بەلکو هەژارێ یا نیشامندای )(19) .

دیـــسان خەم و ژان هەمـــو کەسێــن هەست نازك وخــودان بیـر وبـاوەرێت هێـزدار . . دکـەتـە سوارێت مەیـدانـەکـا پر هنێر وخـزمـەت و بلندکاری ، چ هۆزانڤان بن یان دانەرو نڤیسەڤان بن یان موسیقاژەن بن یان زانایێت گشت رێکێن ژینێ . .

هۆزانڤـانێ خەمخـۆر وهناڤ سووتی (حاجی قادری کۆیی)ب بوو دەروێش ودێـوانەل ناف دۆل ونهالێت کوردستانێ دگەریا مینا بولبـولـەکێ دلـدار و هۆزان دڤـەهـانـدن ودەرگەهێت سەربەستێ دکۆتان .

دلێ وی‌یێ مەزن وفرەهـ هندەك هیڤی تێدا مابوون وچەند پرسیار لـەر لێڤاندا هەبوون ودڤیا بگەهتە راستیا (خۆیەت)یا هنەك ئەگەر و ئومێدان . . .

بەلێ مخـــابن حاجی بوو ریڤینگـەکێ رێ دویـــر وبێ دەست هەلات د ناف ئونتولۆژیا ژینێ دا لەوما بەرسف ژ خەم وکارەساتان دایەڤەو گووتی‌یە :

هەر منم ئیستا وارسی عیسا بێ ژن و مال وبێ کور ومەئوا

- 2 -

هۆزانڤـانێ کورد هندشیان ودەست هەلات هەبووینە وتوانی‌یە بیر ورایێن خۆدەر بیریت ل دویف تاقی کرنێت نەخش وبریار بوو هاتینـە کێشـان دگـەل رێبـازا نەوی پێ‌مـەرام ، وهـزرا دوماهیەکا ئەنجام سەر فیراز کریە ، مینا (خانی) حنێرا خۆ دمەیدانا ئەزمۆنێدا

دیارکری وفەرموویە :
ئەزپیلەوەرم نەگەوهەریمە خودرەستەمەنەپەروەریمە (20)،
یان دەمێ مەلایێ جزیری دبێژیت :
شعرا تە مەلا سحری شەکەر ڕێزە ب موعجز .
زانم ژ لەبێ لەعلێ تە ئەڤ لەفظ و ئەدا گرت (21).
ودەرهەڤا ئەڤێ ڕێکێ (نالی) گووتیە :
(نالی) حەریفی کەس نییە ئولف و ئەلیفی کەس نییە .
بەیتی ڕەدیفی کەس نییە تەفریقە نووسەگەپ دەکا (22) .
دیسان حاجی قادرێ کۆیی وگۆرانی ئەزمونێت خوێند تایبەت هەبوونە ودهێن هژمارتن دامەزرێنەرێت خویندنگە هۆزانێ . . . وزۆر بەی هۆزانڤانێت کورد ڕێکێت ئاسێ وئالۆز برینە وب تاقی کرنێت پر بیر و باوەر مەشکێن هۆزانێ هژاندینەو کێتینە ،لەوما هەر هۆزانڤانەك نیژیارو سەر هۆستایێ چاخێ خۆیە . .
هژین و لەرزینا ژینێ ل بن پێت هۆزانڤانێت کورد دبیتە لێدانا زەنگلا ئەزمونێت مەزن . . . بەرەڤانیا مرۆڤان ل بەر کارەسات ودا کەفتنا مللەتی دبیتە دویر ئێخستن و لاوازیا هۆزانێ و پەیدابونا ڕێکێت نوی . . . خەباتەکا نوی . . هێزەکا نوی . . بیرەکا نوی . . تا دوماهیێ سەرکەفتنەکا نوی دگەل پێشکەفتنەکا نوی بوو هۆزانێ .
بێهن ورەنگێت ڕەش ڕەیحانێت ئاکرێ ژ ئاڤ و ئاخێت دەڤەرێیە ، وئەزمونێت هۆزانڤانێت کورد ژ گەرویێل و شەپۆلێت ڕوێبارێ ژینا کوردەوارێیە نە .
وئەگەر هۆزان دانا خودێیە . . ئەزمون ژ بۆژاندنا هێزا مرۆڤێ ماندیو ڕەنجدەرە . . هەر وەکو جزیری لسەر ئەڤێ ڕویدانێ گووتییە .
فاعلەك لازمەدا فعل و ئەثر پەیدابت .
گەر تو حەدداد نەبت ،کورەئی حەددادی چ کت .
مومکنەك دێ هەبتن داکو طەلەب حاصل ببت .
صەیدو نێچیر کو نەبت تو لەئی صەیادی چ کت .
هەرگل و سەنگ دبتن زێر ب تەدبیری حەکیم .
قابلییەت کو نەبت حکمەتی ئوستادی چ کت .
کان ب گەوهەر چ بکت گەوهەر ئەگەر پاکی نەبت .
تو بەصیرەت نەبت سیرەتی ئەجدادی چ کت . (23)
ڕۆژکێ ژ ڕۆژان یەکێ پرسیار ژمۆتسارتی کر .
- ئەز چ بکەم تابشێم سمفونیا داب نێم ؟
- هێشتا زوییە زیاتر بخوینەو شەهرەزابیە پاشی هەول بدە سمفونیا ب دانێ . .
- تە چەوا سمفونیا ئێکێ داناو هێشتا ژییێ تە نە ب بوو دەهـ سالْ . . !!
- ئەڤە ڕاستە . . بەلێ من پرسیارا کەسێ نەدکر کو چ بکەم وچەوا بنڤیسم . . . (24) .

- 3 -

گەلەك هۆزانڤانان گەشت و گەریان کرینەو شەڤ و ڕوژ و مەهـ وسالْ بۆرا ندینە ل ناف قوناخێت (خویەتی) ێدا مینا ئوکتاڤیوپاز (1914) دبێژیت :
وئەز دچم سەر درێژیا بەردەوامیا ڕێکێت (خویەتی) یاخۆ (25) چونکە هەمیشە هۆزانڤان کیرونقود جیتە دناڤ (خویەتی) یا خوەدا، چاڤێت خوە دنقینیت و دادنێتە سەرێك هەتا بشێت تیڤل و سەرڤەیا ڕەوشتان بکەتە نەینك . . . پاشی ئاڤەرۆك کاکلاژینێ تێدا ب بینیت . (26)
دل و دەروونێت مرۆڤی ئامرازو هەستا دیتنێ هەیە لەوما هومیروسێ کۆرە ئاسوێت ژینێ برینەو داستانا (ئەلیازە) ڤەهاندییە گشت پێتڤیو سنج و نەریت و ڕەواڵە تێن دیارو بەزر پێکڤە دگرێداینە ب وەریسەکێ مەزن ڤە دناڤ پارزینەکێ پیروز دا، لەوما هەڤبەندیا لێك نیزیك بونا نەوان بوویە کارورەنجا مەزن و هۆزانێدا .
قوناخا (خویەتی)ێ دهۆزانێدا دەست پێدکەت ژ دانانا شەنگست و بنیاتان ل ڕەخێ ڕوێبارێ، پاشی ئاڤاکرنا پرەکا موکم و خوگرتی . هەتا هۆزانڤان بکاریت دەربازی ڕەخێ دیێ ڕوێباری ب بیت و ئەڤەیە مەبەستا نڤیسەڤانێ فرەنگی ئەندرە بریتون (1896 - 1966) دەمێ دفەرموت (پێتڤییە مروڤ خۆ بگەهینتە ڕەخێ دیێ ڕوێباری) . .
ل دویف ئەنجاما ڤەنجی پەرستنێ ئەگەرا سەرەکی دبیتە دەربازبونا ئەڤێ پرێو ئاکنجی کرنا هێزا مرۆڤایەتیێ ل ڕەخێ دیێ ڕوێباری و ڤەهاندنا پەیڤ و گووتنان لسەر تەڤنێ ژینێ و ڕێستنا خەم و ئێش و ژانێت مللەتی ب تەشیا سەربەستیێ ڤە . . .
لەورا بریتون پێڤە دچیت و دبێژیت «دەمێ مرۆڤێ شارەزا دەربازی ڕەخێ دی دبیت جیهانا ئاشکراو سەراڤ ب جهـ دهێلیت و کاکلا ژینێ ب دەست خۆ دئێخت» 27 .

ئەرێ راستە هۆزان گەشت و گەریانەکە دناڤ (تاری)یدا بەرەڤ ڕێکا ڕوناهیێ دچیت، وهۆزانڤانێ مەزن (گۆران)ی ئەڤ ڕێکە پیڤایە لەوما گوتی‌یە:

ئەمویست دەروون بکرایەوە وەك تومار

دەرکاو تایە و دویناى جوانتر لە بەهار(28)

گەشت و گەریانێت هۆزانڤانان دناڤ دەروون و (خۆیەتی)یدا مینا نەخشێ بارانێ‌یە دەمێ دباریت دناڤ ئاخ وزەڤیاندا دچیت تخرۆد بیت. باران گیاو درەخت و گولان شین دکەت، وجانێ بوهارێ ساخ دکەتە ڤە، و هۆزانڤان بوومە نەپەنی‌و نەدیار و بەرزەیا ڕویدا نێت ژینێ ئاشکراو دەست نیشان دکەت، و دبیتە پەیسك بوو بانێت بلندو پاپۆر و گەمی بوو ئادێن نەهاتین زانین و باخچێت کەس نەدیتی. هەروەسا دبیتە ڕێبەرێ نوی ڕێکان بوو جهێت نەدیار دلەشێ کومەلیدا، ودبیتە تیرا ڕاست دئاسۆیا ڕۆژهەلاتێدا مینا ئەیدیالیزما (مثالی) تاگوری ڕەهێت خۆ کێشاینە دکاکلا ژینێ‌دا خوارنا خۆ ژ ئەزموونێت جیهانی پەیدا دکەت تا دوماهیێ تایکێت بەلاڤ پێ‌مەزن بین و خەملاوێ سیبەرێ ل خەلکی بکەت (29) وباشترین نیشان و بەلگە لسەر ئەیدیالیزما تاگوری گەیشتنا ئەوی بوو گۆپیتکا دارا مرۆڤایەتی‌یە، دەمێ خویندگەها شانتین کیتان (بەندەرا ئاشتیێ) ئاڤاکری لسالا (1901)و ئەوی بخۆ سەرپەرشتیا وانەو بابەت و پرۆژێت وێ دکر..

پاشی ئەووانە جەماندین د پەرتوکا خۆیا ب ناڤ و بانگ (سادهانا) 30 (تاگوری) دئەڤێ پەرتوکا ناڤ دێردا کەشت و گەریانێت (خۆیەتی) یاخۆ دیارکرینە دگەل جان و جوانیێ وژین و ئەڤینێ....

دەمێ ئەم لسەر (بەندەرا ئاشتیێ) د ئاخڤین ژ بیرامەیە (نوبهارا) ئەحمەدێ خانی یا پڕ خزمەت و دان ل پێناڤا ڕێکا مرۆڤایەتیێ‌و نمونەکا بەرزە ژ خویندنگە هەکا سنجی‌و فێر بوونێ.

دیار و ئاشکرایە کو (خویەتیا) خانی نەخشەکێ جوان و مەزن بوویە، تژی ڕێك و پرۆژەو بڕیار بوویەو قوناخ و کاروان هەتا رادەو پەیسکەکا بلند تێدا چووینە... هەر وەکو د ئەڤان چەند مالکاندا خۆیایە:

ژ پاش حەمدو صەلەواتان

ئەڤ چەند (کلمە) ژ لوغاتان

ڤێك ئێخستن ئەحمەدێ خانی

ناڤێ نۆبار ژ بو بچوکان دانی (31)

جگە ژ گەریانا هۆزانڤانان ل ناڤ گەڕو زڤروکێت (خۆیەتی)یدا، زۆربەی هۆزانڤانان حەزگەریان و گەروکێ کریە مینا هۆزانڤانێ مەیێ ناڤدێر (تاگور) ل گشت دەڤەرێت جیهانێ گەڕیایەو گەریانا ئەوی ل چیایێ هیمەلایا گەلەکا ب ناڤ و ودەنگە. و (کەشتی هەورامان) گۆرانی هەمبەری وێ‌یەو ئەگەر زیاتر نەبیت..

ئەڤ ڕەوالەت و سەخلەتا بنەجهـ ل دەڤ هەموو هۆزانڤانێت کورد هەبوویە مینا مەلایێ جزیری دبێژیت:

بێ‌حساب شۆخ و شەپالی ل (مەلێ) قەهر و غەدەرکر

نە ئەم ئانینە خیالی نەل حالێ مە نەظەر کر

قەط نەکر شەفقە لباسێ غەضە بێ‌زێدە د بەرکر

عللەتا جەورو جەفا و ئەلەمێ جهـ ب جەگەرکر

عەللی‌لا نەدین دفراقێ ستەمی سینە ب کەرکر

ئاهی حەتتا مرنێ ئەڤ ژمەرا داغ و کەسەرکر

سەفەرا شام و عراقێ ل مەخصوس لازم و فەرکر (32)

ومەلایێ باتەیی د گەریانەکا خودا دبێژیت:

دچریا پاشیێ پێدا

مەلایێ باتەیی کانێ

(سفر) کێشا ب مکسێ‌دا

ل سەر وەختێ زڤستانێ (33)

دیسان گشت هۆزانڤانێت کورد کەشت و گەریان کرینە مینا تەیرانی‌و پەرتوێی هەکاری‌و نالی‌و ئەخلاتی‌و کوێی‌و سالم... هتد

- 4 -

دناڤ هەردوو چاڤکێت تەرازیا مرۆڤایەتیێ دا (خزمەت) و (خویەتی) ل دەڤ هۆزانڤانێ کورد د یەکسانن و ب درێژیا دیرۆکا ئەدەبێ کوردی ئەڤ تەرازیە لەنگە نەبوویە مینا مەلایێ جزیری دفەرمووت

چوم طەوافا پێ‌و دەستان.

شوبهەتی سەکران و مەستان (34).

دویف ئەڤێ خۆشکاندنێ مەلایێ جزیری هەڤرکیا هەر کەسەکی دکەت کو تەمەت وی فیداکار ومەردو شێر دل بیت بوو یارا خۆ (ئەگەرا ئەوی پێ مەرام):

چەندەکی صادق جەمابن.

ئەر ب بێژی جان فدابن.

وەك مەلێ لازم تونابن.

وی ژ دل جانێ خوه دایه (35).

دیسان هۆزانڤانێ مەزن (نالی) گەیشتبوو رادەکا هند بلند وژیهاتی ب رەنگەکێ خۆشکاندنێ چاکی وپاکیا نەریت و رەو شتێن بەستە زمانان بەرچاف کر بوو مینا دبێژیت :

هیندە پێم خۆش بوو زمانی حالی دەیگوت : نالیا !

هەردوو حەیوانین ئەتۆ گو کورت وئەمینش گو درێژ (36).

هەمی کەس دکارن سەر پەیسکێن بلند وکریارێن مەزن ب ئاخفن و بدوێن بەلێ نەشێن دناڤدا بژین ، لەوما پێغەمبەر دکێمن وژینا ئەوان کارەکێ ئالۆزو نەکۆك وناستەنگدەرە (37).

ئەحمەدێ خانی پشتی (مەم وزینا) رەنگین ڤەهاندی وئێش وژانێت مللەتێ کورد دناڤدا دارشتین و ب سەرفیرازی کاروانێ هەونەرو جوامێر یێ گەهاندییە بنەجهێ دروست ورایێك وجوان . .

راستە ئەڤە هنێرەکا مەزنەو نیزیکە ژ کاروکریارێت پێغەمبەران دگەل هندێ خانی هیڤی و داخوازیا لێ نەگرتێ ژ خەلکی دکەو دبێژیت :

اصحاب غرض کو هبدێرن .

عەیبان ب کەرەم ل من ڤەشێرن (38).

هەروەسا هۆزانڤانێ مەزن (خانی) هند دەلیڤە ل دەست خۆ دیتییە کول جڤاتا (خویەتی)ێ رویتە خواریێو بنگەهێت چاك وبلند هەڤبەند بکەت دگەل پەیڤ و نڤێژێت پەرستگەها خزمەتا زمانێ کوردیدا ژبەر هندێ گووتییە :

ئەزلالم و بێ زمان و خاموش .

بێ نفس و نفس ژ قسمی قاموش (39).

ڤیان و حەز لێکرنا خانی بوو جوانیا بلند درێکا مرۆڤایەتیێ دا ل بەر سێبەرا خۆراگرتنێ ب بوو کاروانێ ڤوناخەکا نیزیك و نەخش کێش دخویەتیا (مللەتێ کورد)دا پاشی گەریان ل دویڤ هەبینا هونەر وتورەکێ سەرفەراز وئێکانە دویر و جاواز ژ رویبارێد کەڤنە پەرستنێ

هۆزانڤانێ مەزن پەرتوێ هەکاری هند باوەری ب خۆ هەبوویە کوب بیتە زێرەڤانێ بورجا ئەڤینێ ومینا ڤیهرس ومێرچاکێت کوردان چەپەرێ ژینێ بکەتە وار وزۆمێت بوهارا سەربەستیێ .

دیارە گشت شەنگستێن خویەتیێ ب تەڤشێ ئەویڤە هاتینە کولان لەوما هەڤرکیا هێزەکا نهێنی دکەت و دفەرمووت :-

ئەڤ نیازە پر تویێ دائم ژ شاهێ بێنیاز .

یا وصایا رێ حاصل یا بدت جانی طەلاق (40).

هۆسا پەرتوی زیرەکی ومێرخاسیو بلیمەتی ل ناف ئاشێ (خویەتی)یدا دهێران بەلێ دەمێ یارا ئەوی لەگەنا دانی دهینا ، دا ب هۆشیاری وهەستڤانی ئەوی ئاشی ب جهـ هێلیت و دگەل دلبەرا نازك شەپال رویتە خواریێ و وەفاداریو خۆشتەڤیا خۆ کەتە باللك و نڤین و جڤاتەکا پر وتژی دلپاکیو ئەڤینی گرێدەت :

یارم ژ رەقیبان چ خەتا کارتر نیرو .

پرتو ژ سەگ بازی وەفا داترم ئەز (41).

و هۆزانڤانێ مەزن و ژیهاتی (وەفایی) خوش و سەرفیرازیا دونیایێ هەمێ دچاڤێت یاراخوەرا دبینیت . . . ونەگەر یارا ئەوی دگەل نەبیت دونیا . . هەتا بەهەشت بوچییە . . ؟؟

ونەڤە بەرزترین پلەیە ژ پێسترکا ئەڤینیا پیرۆز ، و بلندترین رادەیا خۆگوری کرنێیە ژ پێناڤا خزمەتکرنا ئومێدێ - هیڤیێ . . .

دەمیکی روت بگرم زولفت لادەم .

بەخوش هەردوك دونیات نادەم .

کە توم بێ چم لە روضەیی ئادەم .

بەهەشت وا خوشە توی تێدا بی (42).

هەروەسا فەقێ تەیران پەیکا (خویەتی) یا خۆ دکەتە ستێرا گەلاڤێژو کاروانێت پاهیزێ ب رێڤە دبەت و بابەلیسکا ل نیڤا بێدەر وجوخینان باددەت . . . پاشی مینا دیوانەکێ شێت وشەیدا چاڤە رێیێ ئەگەرا پیرۆز دبیت و ژحالێ خوەرا دبێژیت :

تولەیی دەرگاهی یارم .

شەڤ و رۆژ نو بەدارم .

وەستایی دەر ئینتظارم .

چاڤەری سولطانم ئەز (43).

پشتی ئەڤ جوار خالێت سەرەکی (ژان وخەم - ئەزموونا تایبەت کەشت وگەریان - خزمەت و قوربانی) مە کرینە بنگەهێت (خویەتی)یا هۆزانڤانێ کورد . . . وب ڤەکولین وخویندنا ئەڤێ (خویەتی)ێ گشت سەخلەتێن مرۆڤایەتیێ دهینە بەرچاف وهندی ئەم هویرتر بەرێ خۆ بدەینە ژینە نیگارێت هۆزانڤانێت کورد دێ بینین دارا مرۆڤایەتیێ هەر مەزن ورەوشتر لێدهێت دناڤ باخچێ جیهانا خویەتیا ئاڤدێران . بۆیە پراگماتزما دیرۆکا تۆرێ کوردی زنجیرا خەباتەکا مەزن و بەرەڤ ژیهەل دهێتە مەیدانا بسپۆریێ وکارزانیێ وشەهرەزایا خەمخۆر و جوامێران . .

ژێدەر و تێبینی :

1 ـ دویف بیردۆزا ڕێژەیی .

2 ـ مەم وزینا ئەحمەدێ خانی چاپا هەڤلێرێ 1968 بەرپەرێ 36 .

3 ـ دیوانا مەلایێ جزیری ـ توێژاندانا صادق بهاء الدین ئامێدی ـ چاپا یەکێ ـ بەغدا ـ 1977 بەرپەرێ 86 .

4 ـ دیـوانی نالی و فەرهـەنگی نالی ـ لێکـوڵینـەوە ساخ کردنـەوە ـ د مارف خەزنەدار بەغدا ـ 1977 بەر پەرێ 52 .

5 ـ ژ ڤەکـوڵینـا بەرفرەهـ و خوێنـدنـا زانستی ل سەر کە لەپویرتێ کوردی ؟چیـرۆك ـ داستـان ـ ئەفسانە ـ لاڤژەوستران ـ سەرهاتی و سەربووری و مەتەل . . . ) دێ گەلەك قوناخ و ڕێك و کاروکریاێت بەزرو وندا ئاشکراو خۆیابن .

6 ـ چەنـد شاعیـرەك دهـەرێمـا بەهـدینـان دا ـ د. نافع ئاکرەیی ـ بەغدا ـ 1978 بەرپەرێ 79.

7 ـ قمم في الأدب العالمي ـ د. بديع حقي ـ دمشق ـ 1973 ص 101.

8 ـ دیـسـان دیـوانـا مەلایێ جزیـری ـ بەرپەرێ 146 ـ وبەرپەرێ 441 .

9 ـ کۆڤـارا ئەکـادیمیـا کوردی ـ بەرگی چوارەم ـ سالا 1976 ـ خارکا بەرپەرێ 132

10 ـ گەلـەك جاران ناڤێ هۆزانڤـانـان هاتیە گووتن دناڤ شعرێن کوردیـدا مینـا خانی وتـەیرانی ومیر (عماد الدين)ی وئاگاداریامە ژ نەدەرکەفتنێ ژ بابەتی تەنها مە ئەڤ چەند مالکە کرنە نیشان .

11 ـ دیسان مەم و زینا ئەحمەدێ خانی بەرپەرێ 37 .

12 ـ عصفـور من الشـرق ـ توفيق الحكيم ـ الطبعة الثانية 1943 ص 3 .

13 ـ دیـسان دیوانا مەلایێ جزیری بەرپەرێ 434 .

14 ـ دیـوانی بێ کەس ـ محەمـەدی مەلا کریم ڕێکی خستـووە ـ بەغدا ـ 1980 ـ بەرپەرێ 55

15 ـ دیوانا پەرتوێ هەکاری ـ بەرهەڤکرن و توێژاندنا صادق بهاء الدین ئامێدی ـ بەغدا 1978 بەرپەرێ 91 .

16 ـ دیسان مەم وزینا ئەحمەدێ خانی بەرپەرێ 112 .

17 ـ دیـوانی گوران ـ بەرگی یەکـەم ـ محەمـەدی مەلاکـریم کوێ کردوەتەوە ـ بەغدا 1980 بەرپەری 230 .

18 ـ پاشکـۆیـا ڕۆژنـامـا عیـراقێ ـ بەغـدا ژمـارە (23) 1979 بەرپەرێ 4 .

19 ـ الغريب ـ البير كامو ـ ترجمه فوزي عطوي ونديم مرعشلي ـ بيروت 1967 ص 147

20 ـ دیـسان مەم و زینا ئەحمەدێ خانی بەرپەرێ 42 .

21 ـ دیـسان دیوانا مەلایێ جزیری بەرپەرێ 143 .

22 ـ دیـسان دیوانی نالی بەرپەرێ 53 .

23 ـ دیـسان دیوانا جزیری بەرپەرێ 147 .

24 ـ

25 ـ ادب امريكا اللاتينية الحديث ـ د. پ . غالفر ـ ترجمه محمد جعفر داود ـ بغداد 1977 ص 103 ـ 104

26 ـ اضـواء على الشعـر الحديث ـ راجي عشقوتي ـ بيروت 1973 ص 27 .

27 ـ کۆڤارا (الموقف الادبي) ـ دمشق السنه الاولى ـ العدد الأول ص 46 .

28 ـ دیـسان دیوانی گۆران بەرپەرێ 121 .

29 ـ طاغور ـ جميل جبر ـ القاهرة ـ 1958 ص 94 .

30 ـ روائع طاغور في الشعر والمسرح ـ د. بديع حقي ـ بيروت 1973 ص 18

31 ـ نوبهـارا سەیـدایێ مەزن ئەحمـەدی خانی ـ خرڤـەکـرن و ل دوی چۆن و توێژاندنا صادق بهاء الدین ئامێدی ـ بەغدا 1979 ـ بەرپەرێ 29 .

32 ـ دیـسان دیوانا مەلایێ جزیری ـ بەرپەرێ 484 .

33 ـ ژ دیوانەکا دەست خەت یا مەلایێ باتەتی .

34 ـ دیـسان دیوانا مەلایێ جزیری بەرپەرێ 363 .

35 ـ هەر ئەو ژێدەر بەرپەرێ 364 .

36 ـ دیـسان دیوانا نالی بەرپەرێ 65 .

37 ـ من البرج العاجي ـ توفيق الحكيم ـ القاهره ـ 1941 ص 38

38 ـ دیـسان مەم و زینا ئەحمەدێ خانی بەرپەرێ 42 .

39 ـ هەر ئەو ژێدەر بەرپەرێ 179 .

40 ـ دیـسان دیوانا پەرتوێ هەکاری بەرپەرێ 148 .

41 ـ هەر ئەو ژێدەر بەرپەرێ 128 .

42 ـ دیـوانی وەفـایی ـ لێکـۆڵینـەوەی محەمەدی عەلی قەرەداغی ـ بەغدا 1978 بەرپەرێ 176 .

43 ـ ژێدەرێ شەشێ بەرپەرێ 40 .

# چیخۆف

## لەسەرەتای دەست پێ کردنی دا

● وەرگێرانی :ـ سەرگوڵ محمد أمین ●

گەلێ شت دەربارەی چیخۆف دەزانین ، بەڵام لە شتێکی کەم پتر چیدی دەربارەی «چیخۆنت» نازانین کەبەو ناوەوە کارە نۆبەرەکانی بڵاو دەکردەوە ، هەر دێریکی بەعانەیەك بڵاو دەکردەوە . بەڵام ئەوعانە کەمانە سەرچاوەی بژێوی باوکێکی لات و دایکێکی چاو بە فرمێسك بوو ، هەروەها برایەکی هەمیشە کەوتووی کونجی مەیخانەکان و خوشکێکی خۆشەویست و چەند خزم و کەس و کارێکی بێ کارە. کاتێ کە هێشتا دکتۆرێکی بچووك بوو . هەر هەژار بوو بەڵام پشتی بەو دەست مایە کەمە قایم بوو کە لە ئەنجامی بڵاوکردنەوەی چیرۆکە گاڵتە ئامێزو مەیلەو دراماو دەقە کاریکاتێری و کورتە چیرۆکە داشۆرینەکانی یەوە دەهاتە دەستی ، کەرۆژنامە ناوچەییەکان بۆیان بڵاو دەکردەوە، چیخۆف دەیزانی نەخۆشی سیلی یەتی، خوێنی هەڵدێنا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەنێوان ساڵانی 1880 ـ 1888 سەدان ووردە بابەتی نووسیوە ، ئەمە جگە لەو شتانەی دەربارەی شانۆو پروپاگەندەی کۆمەڵایەتی دەی نووسی یەوە هەموو ئەم شتانەی کۆکرایەوەو لەماوەی 14 ساڵدا، 14 جاران لە ژێر ناوی «سەرگوروشتەی هەمە جۆر»دا لە چاپ درایەوە. ئایا لە نێوان ئەو هەموو شتەدا، لە بن دێری ئەوگشتە نووسینەدا پێشبینی هەڵاتنی هەتاوی بلیمەتی یەکی ئەدەبی بەدی دەکرا ؟! یان « سوفورین» ی دەوڵەمەندو هەلپەرست و پاش کەوتووی خاوەن رۆژنامە چۆنی توانی ئەو بەهرەیە بدۆزێتەوەو ئامۆژگاری خاوەنەکەی بکات کە روو لە جیهانی ئەدەب بکات ؟ ئەگەر لە شەخسیەتی چیخۆف وورد ببینەوە ، ئەوەمان بۆ دەر دەکەوێ کە کابرایەکی دوو لایەن نەبووە. هەر بە سروشت ئازادو سەر بەخۆ بووە ، خووی داوەتەوە ئەوەی کە لە چوار چێوەی کارکردن و رەسەنایەتی دا خۆی بدۆزێتەوەو خۆی لە هەموو پاشکۆیەتی یەك رزگار بکات هەمیشە بایەخی بە بابەتی چاك و هەڵبژاردە داوە، سەر لە نوێ دای رشتووەتەوە ، ئەو شتانەی نووسیبونی هەموو پاراست بوو، هەوڵی دەدا کەڵکیان لێ وەربگرێ و شێوەیەکی تازەیان بداتێ ، تواناو تاقەتێکی فرەی هەبوو ، ئەو تواناو تاقەتەی بەزۆری لەو کەسانەدا دەبینرێ کە دەزانن زۆر ناژین

چیخۆف لەماوەی ئەو ساڵانەدا بەلای کەمەوە فێری ئەوە بوو کە تەخت و پوخت بێ . دەی زانی «چیخۆف» ێك خۆی لە ناخی «چیخۆنت» دا شاردوەتەوە ، خۆی لە کۆتاییە خێراکان دەرباز کرد ، بەڵام هەست کردنی بە درێژە پێدانە بچووکەکان لە دەست نەدا . ئەم هەستەی کە لەو نامانەی‌دا بۆ هاوەڵەکانی ناردووە بەدی دەکرێت . بۆ نموونە لە یەکێك لە کاغەزەکانیا نووسیوێتی «نەهەنگێك لە ناختایە لیکا » . . کارەسات و خەم و بێزاری هەموو لە لایەکەوە دەوەستا ، بەهۆی پێوەندیانەوە بە کۆمیدیاو گاڵتەجاری دەست کردەوە. درێژە دان بە بایەخ تر بوو چونکە پەردە لەرووی خەڵکی هەڵدەداتەوە وەختێ کە بێ سڵ کردنەوە دەدوێن و خاوەنەکانی خۆیان دەنوێنن . وەك چۆن باتریك مایلزو هارفی بتشر ، وەرگێرانی «چیرۆکە نۆبەرەکان 1883 ـ 1888» لە پێشەکی کتێبەکەدا دەڵێن :ـ گورج و گۆڵی و چالاکی خەسڵەتی ئەوەڵ و ئاخیری چیخۆف بوو : خەسڵەتی دووەمی مەرنجە تیژ و ووردەکانی بوو دەربارەی هەموو ووردو درشتێ » ، ئەوەی کە «نابوکوت»

لەشـوێنێکی دیدا نێـوی دەنێ «التفصیـلات الخـالصـة» . چیخۆف وەکو هاو وولاتی یەکی روسی سەر بەچینە هەژارەکە توانی لە ڕێگای ڕەمەکی خەڵکی یەوەروس بناسێت

چیخـۆف هەوڵی دەدا خوێنـەر بهێنێتە پێکەنین ، دەربارەی گەنجێکی هیـچ وپـوچ دەی نووسی ، کـە لەنیـوە شەوێـك دا دایـك و بابی خۆی بێـدار دەکـردەوە بۆ ئەوەی مژدەی ئەوەیـان بداتێ کە ئاخـری توانی نێـوی خۆی لە ڕۆژنـامـەیـەکی ناوچـەیی دا دەربخـات ، گـالیسکـەیەك لێ یداو لە ئەنجامی سەرخۆشی دا زامدار بووە . یان باسی ووتاری کابرایەکی دینی لە داب و دەستـوری مەرگی کەسێـك دا باس دەکـرد ، کە ئەو کەسـە مەبـەست نەبـووە . یان باسی پارێـزەرێکی دەکـرد کە موبـالـەغـەی لە بەرگـری کردن لەمـوکیلەکـەی دەکـرد . یان هێنـدەی بەشان وباڵی چاکی و خەمی تاوانباران دا هەڵدەگوت وای لە کابرای تاوانبار دەکرد خۆی پێ نەگیرێ و لە بەردەم کوڵی گریان دا هەرەس بێنێ و بەخۆی دان بە گشت شتێك دا بنێ . یان باسی بازرگـانێکی دەکـرد تابـوتێ لە بەر ماڵی خۆی دا دەبینێ و وا دەزانێ یەکێـك لە هاوەڵـە کانی مردووە ، کـەچی خەیـاڵ دەی بردەوە بۆ ئەو شوێنـەی کە تابـوتەکە بۆ خۆی ئامادە کراوە . یان باسی ئەو خانمـە ڕۆشنبیـرە دەکات کە توانی خۆی بگـەیەنێتەوە ژووری نووسەرێك وشانۆگەری یە 10 بەشەکەی بۆ بخوێنێتەوە ، تا کابرا وەرس بوو ، مێشکی لەمە بوو ، ئەوجا کاغەزەکانی بەرووی خانما داو ، خانم مرد ، کەچی لەدادگادا تەبرێ بوو . لـە چیـرۆکەکانی تریدا ، فەرمانبەری لەخۆبایی ، پۆلیس زۆردار یان دایکانێ دەبینی ڕەواج بۆ کیژەکانیان پەیدا دەکـەن ، یـان قەشەیەك دەبینی موحازەرە بۆ کۆمەڵە قەشەیەکی دی دەدات و باسـی خراپی ژ ن هێنـان دەکـات ، هێنـدە بە ساماناکی باسی دەکات قەشەکانی دی لەترسان دا موحازەرەکە بەجێ دێڵن . یان پیـاوێ خەریکی مەلـە کردنـەو جلەکـانی دەدزرێ ، دەیـەوێ بە رووتی بە شەقامەکانی شاردا هەڵێ . .

ئەمانە تێکرا لە چیرۆکە نۆبەرەکانی چیخۆف دا دەبینرێ

بیـری چیخـۆف توانـایـەکی گەورەی لە دروست کردنی هەڵـوێستی کۆمیـدیدا هەبـوو ، ئـەوەی پتر لەزەتی دەداتێ وەسفی دەمـو چاوو ووردی سەرنجـە بەڵام ئێمە لە کۆتایی ئەم قۆنـاغـەدا هەست بەسـەرەتای گۆڕان دەکەین لایەنی هونەری نەشـو نمـا دەکـات :ـ لە چیـرۆکی «ملاحظات على صحيفة رجـل سريـع الانفعال»دا گێرانەوە لە ڕێگای راناوی قسەکەردا دەر دەبـرێ . لـە چیـرۆکی «الصيـاد»دا سەرەتـای بلیمـەتی چیخـۆف دەر دەکـەوێ ، دوای ئەمـە لە چیرۆکی «الساحرة»دا ، ئـەوجـا چیرۆکی «القبلة» ئەوچیرۆکە نێوداری کە لە هەندێ دیمـەنی خانوو بەرە دێهاتی یەکان و دیمەنە سەربازی یەکان دا قەرزاری تورجنیف» 5 . بەڵام چیـرۆکی «فیـروتشا» لە گشت کارەکانی ئەم قۆناغەی چیخۆف ڕاستگۆیانەترە .

دوو وەرگێـرەکـە پێیـان وایـە : هـۆی بنچ بڕی بەرەو پێشەوە چوونـی چیخـۆف لەوەدایـە جارێکی دی سروشت و جوانی دیمـەنـەکـانی ، وەرزەکـانی ساڵ ، گوڵی گەش ، دارستـان ، زەلکـاو ، ڕێگـاو بانـە درێـژەکـان ، ئـاسـۆو ئاسمـانـە ڕەنگاو ڕەنگـەکـانی دۆزی یـەوەو پێیـانـدا جووەوە ، گشت ئەمـانـەی هێنـایـەوە مەیـدان نەك هەر وەکـو دیمـەن و بەس ، بەڵکو وەکو هاوتایەك ، شان بە شانی ڕووداوەکان هێنانی یەوە گۆڕێ .

لە چیـرۆکی «الاحـلام»دا خەون بەدی ناکـەیت ، بـەڵکـو ڕەنـگە دانـەوەو هیـواو ترس بەدی دەکەیت ، تەنانەت بۆچوونە نەزۆکـەکـانی ئەو دوو کابـرا عەسکـەری یـەش کە کابـرایەکی دەرۆزەکـەری ناسکیـانی گرتـووە ، دەیـان میـل دەبرن ، هیچ شتێکی ئاڵۆزو نهێنی لێرەدا نی یە . خەسڵە تە ڕوسی یەکەیان

لێ جودا نابێتەوە ، بە ئاشکرا لە قسەکردنیان دا دیارە ، لە گوێ نەدانیـان بە یەکـدی . لـە خەم ساردی یـان دا دەر دەکـەوێ . وەختێ بەنـاخی ووردو درشتی حیـوارەکـان دا شۆڕ دەبینـەوە بۆمـان دەر دەکـەوێ کە ڕەخنـەگـرەکـان لەوەدا بە هەڵەدا چوو بوون کە گوایـە چیخـۆف غەمگین و خاوەن مجێزێکی پەست بووە ڕەنگـە پاڵـەوانـەکـانی گەوج و تەنیـا بووبن . بـەڵام ئەمە سـەرچاوەی توانـاو سەبـریان بووە ، کە خۆی لە خۆیدا ڕادەی توانـاو دان بەخۆدا گرتنی چیخۆف » .

تێبینی : بڕوانە ڕۆژنامەی الثورة 1982/7/7

# ئه‌لزا نه‌ماو ئه‌راغون هیشتا سافه

• سگڤان عبد الحكيم •

ریكـا كلاسيكيـه‌تێ و ئه‌ڤين ونيشتمـان په‌روه‌ريێ ژلایێ رومـانافه لسالا 1921 (آنسية) روناهي‌ديت و(أجراس بال) لسالا 1934 ده‌ركه‌فت و(لأحياء الجميلة) لسالا 1936 هاته به‌رده‌ست ولسـالا 1941 (المسـافـرون) ده‌ركه‌فت . ولسالا 1944 (أورليـان) به‌لافبـو ولسـالا 1971 (هنـري ماتيس) ده‌ركـه‌فت وروناهي ديت وجـوانتـرين ومـه‌زنترين رومـانـا ئه‌راغونی یابهێز (الاسبوع المقدس) بو

لێ چاڤێت ئه‌لـزايێ دێ مينيت داستـانا ره‌وشه‌ن وپر ئه‌ڤينا پاقژ وراست ودرست

بخاترا هه‌وه گه‌لی كوڤانا
گه‌لی خوشيا
بخاترا هه‌وه گه‌لی كوليلكا
بخاتراته ئه‌ی ژيان
بخاترا هه‌وه ئه‌ی روناهی
ئه‌ی بای وهر

مه‌زنێت ڤی چه‌رخی دڤـه‌هـانـد ناهـوزانـادا پێنج بون : ناظم حكمت ـ بول أيلوار ـ ندريكو غارسيا لوركا ـ بابلو نيرودا ولوی آراغون . .

چار ژ وان مرن . . بوونه شه‌هيدێن راستيێ ژ بوهوزانا ژ بو خه‌باتیێ وژ بـو هاتنـا مروڤێ نوی یێ پێنجێ أراغـون ، هێشتا ساخـه ودلێ وی تژی ئاگـر و به‌فـرا سێ به‌هرێت ڤی چه‌رخينه . . ژ بلی بشكوريا به‌رزه سه‌ر لێڤێن پر كوڤان . .

(ئه‌ز دزانم چ ڤيان بوژینێ من نه‌ما پشتی مرنا ئه‌لزايێ)
ئارغـون لبـاژێـرێ پاريسێ لدويمـاهيكـا سالا 1897 هاتـه دونيـایێ و ده‌ست بژينـا خوكـر لژێر بزاڤا دادائيه پشتی هينگی سوريـاليـه‌تێ نڤيسينێت وی رونـاهی ديتن وه‌ك (نـارالحبـور) لســالا 1920 و أنيســه لسـالا 1921 ـ مزارع باريس لسـالا 1926 ونڤيسينا (دراسة حول الأسلوب) هێشتا ژ یێ وی چار سال و ده‌مێ دگـه‌ل ڤيـزه‌كی دنـاڤ ئێـك نڤينك نڤستی و ئه‌ڤ روژه قه‌ت ژ بيـرێ نه‌چوو هه‌تا نهوژی ژنكێ و ئه‌ڤینێ ده‌وره‌ك مه‌زن هه‌بو وژ یاراويدا . . .

جوانتـــزين نڤيسينێت آرغــونی ئه‌ون یێن هاتينـه نڤيسين دسـالێن به‌رسينـگ گرتنـا واگيـر كرنـا ئه‌لمانيا لشه‌رێ جيهانيا دوویێ و ئه‌ڤ هوزانێـن هه‌تیـكـه‌لبـون دگـه‌ل خه‌بـاتێ و سه‌روچاڤێت ئه‌لزايێ هه‌ر سه‌روچاڤێت وه‌لاتی بوون و ره‌نگێ خه‌باتێ بو درێكا وه‌لاتی‌دا .

چارده سالێ بوريــن سه‌ر مرنـا ئلزايـێ ئه‌وا ئه‌راغــونــی ژێــرانڤيسی . . ژ وه‌لاتی‌را د خه‌بـاتـا راميـاری‌را . . چنكـو ئه‌راغــون دبێــژيت چ جوداهی نوينـه لنـاڤ به‌را به‌خشـانێ وهـوزانێ و ئه‌وبه‌رهـه‌مێت من نڤيسين لدويڤ بيرو هزرێن من بين و ئه‌ز حه ژ خوگرتنێ ناكه‌م وهوزان هه‌ر ئه‌وهوزانن ئه‌وێن بهـه‌لكـه‌فتنـا تێنـه گوتن و ئه‌ڤ راستيه (غوته)ی بخو پێنياسين پێ كر .

دشـــه‌رێ جيهـانيـا دوویێ ئه‌راغـون ئێـك بووژ كه‌نكـه‌نێت قومـانـدارێت به‌رسينـگ گرتنێ بون لنـاڤ به‌را توره‌ڤـان و هوزانـڤـانـادا ولوی ده‌مـی یانكـو لسـالا 1941 (القلب المكســور) به‌لافكـر ولـد ويڤـرا لسـالا 1942 (عينـا ئه‌لـزا) به‌لاڤكـر د(متحف غريڤن) وتێـدا خه‌رپيا خوديارده‌كه‌ت سه‌ر



قیز کامن شوی بکه
و بەختیار ببە
وجار جار هزرا من بکە
وتویا دمینی هەروهەر
دناف جوانیا هەمی تشتا
و ئەڤ هۆزانـــا بەرکـــەفتی وەختی ئەراغـون خەبـاتکـەرژ بـو
سەرفەرازیا وەلاتی خوگوتی
هوین داخازا شەهنازیێ
ورونډکا ناکەن
هوین داخازا موسقیێ

ونڤیژ ێن کوڤاندارا ناکەن
یازده سالْ . . ئاخ وەخت
چەند زوی دبوریت
یازده سالْ
هەوە چەك بتنێ بکارهینا
مرن چاڤێت هەڤالا ناڤەشێرن

# "دەریاچە" کەی

# لامارتین

وەرگێرانی لە فەرەنسی یەوە

● نجات حمید احمد - ●

لامــارتین هەرگیــز مرۆڤێکی ئەدەب دۆست نەبــوو و قەت بیـریشی لەوەنـەدەکـردەوە ببێ بە شاعیر/ ئەوەبوو هەر لەساڵی 1811وە دەســتــی بە گەشــت وگەڕان کرد/ لە یەکـێــك لەگـەشتـەکـانیـدا بۆشاری «ساڤوا»/ لە ساڵی 1816 لەگەڵ «شارل خان»دا ناسیاوی پەیداکرد ، شارل ئافرەتی کابرایەکی زانـابـوو /زۆر ناسـك وجووان بووو لامـارتینی خستـە داوی عەشقی یەوە . بەڵام پاش دوو ساڵ دووای ئەم خۆشەوسیتی یە شارل دەمـرێت . ئەم خۆشـەویستی یـە کورتـە لامارتینی کرد بەشاعیر، شیعرەکانی لامارتن نە لە زمان و نە لەشێوازوو نە لە ناوەڕۆکــدا شتێکی نوێ یــان تیــا نەبــوو /بــەڵکـوو ئەوەی لەشیعـرەکـانیـدا دەیبینین پشکـۆی بەگـری هەست و نەستی شاعیرو ووشەی ڕاستگۆی گیانی شاعیرە /لە هەر لاپەڕەیەکی شیعـرەکـانی لامـارتینـدا هەست بەو مرۆڤـە دەکـەین کەسات لەدووای سات چاوەڕوانی لەناوچوون دەکات . ئەم شیعرەشی لەو ساتەدا نووسی /کاتێ بەڵێن وا بووو لەگەڵ «شارل» دالە سەر دەریـاچەی«ساڤوا»یەکتر ببینن /بەڵام شارل لەبەر ئەوەی زۆر نەخــۆش بوو نەیتـوانی بچێتـە ژووان ،شـاعیـریش لە چاوەڕوانی «شارل»دا هەستی خۆی بۆ دەریاچەکە دەردەبڕێت

## - دەریاچە -

**شیعری : لامارتین**

بەم جۆرە، هەمیشـە بەرەو کەنـاری نوێ بەکێش دەکرێین، لە نێو شەوگاری نەمردا بێ گەڕانەوە بە شان دەدرێین، ئاخۆ دەبێ لە سەر ئۆقیـانووسی تەمەندا قەت نەتوانین تەنها ڕۆژێك ئۆقرە بگرین ؟

ئای ئەی دەریـاچـە : ساڵ پێنی تۆزێـك وەرزەکانی تەواوکرد، لەنـزیکی شە پۆڵـە ئازیـزەکـانـەوەکـە دەبوو بیانی بینیایەتەوە، بروانـە : بەتەنها هاتووم لەسەر ئەم بەردە دانیشم کە ئەوت بینی لە سەریا دادەنیشت !

ئا ئاوا لە ژێر ئەم تاشە بەردە قووڵ بووانە یا خورەت لیۆەدێ، ئا ئاوا بە ناو قەدی ڕزاویـانـەوە لە شت پەرش وبڵاودەبێ ، ئا ئاوا بایەکەش کەفی شەپۆڵەکانتی
هەڵدەدایە سەر پێ یە پەرستراوەکانی .

شەوێـك بە خامـۆشی سەوڵمـان لێ دەدا، ئاخـۆ هەر لەیـادت ماوە؟ لە دوورەوە لە سەر شەپـۆڵ و لە ژێـر پەردەی ئاسمانەوە، گوێمان لە هیچ نەبوو جگە لە هاژەی سەوڵەکان کە بە ئاوازەوە دەیانکێشایە شەپۆڵە هارمۆنیاکانتەوە .

لە پڕێکـدا لە سەر زەوی کەنـارە سیحـراوی یـەکـەیا دەنگی ناسك و نەناسراو تێکەڵ بە دەنگ دانەوەکانا دەبوو، شەپۆڵەکە ئاگاداربوو ئەو دەنگەش کەلام ئازیزبوو
ئەم ووشانەی لێ بە جێما :-

«ئای زەمان، دەکاروانت دوواخە : ئێوەش هۆساتەشیرینەکان
بە سەرچوونتان بوەستێنن :
دەبێڵن با خێراترین چێژ ی قووڵ
لەجووانترین ڕۆژگارمانا بچێژ ین :

«زۆز لە خەمباران لەم خوارەیا لەتۆ دەپارێنەوە ئەی زەمان ،
دەبچۆرێ ، بچۆرێ بۆیان ،
لەگەڵ رۆژگاریانا ئەو دوودڵی یەشیان لێ بەرەوە کە هەناویان
دەخواو دڵشادەکان لە بیری خۆت بەرەوە

«بەڵام بێ هوودە داوای چەند چرکەیەکی تر دەکەم ، کات لە
دەستم دەردەپەرێو دەروا ،
بەم شەوگارە دەڵێم «دەتۆزێ لە سەرخۆتر بە » ،
ئەوسا سەحەر دێو شەوگار لە ناو دەبا .

کەواتە با یەکترمان خۆشبوێ ، با دڵداری یەك بین ،
لەو کاتانەی رادەکەن پەلەکە بابیچێژین !
مرۆڤ هەرگیز وەستانی بۆنی یە ، کاتیش هەرگیز کەناری
نی یە ، ئەو دەرواو ئێمەش بەسەر دەچین!»

ئای ئەی زەمانی بێ ئامان ، ئاخۆ دەشێ ئەم ساتە
مەستانەمان ، کە خۆشەویستی پر بە دڵ شادومانیمان بۆ
دەرژێنێتەوە ، هەروەك و رۆژگارەکانی بەد بەختمان
ئاوا بە پەلە بفرن و لێمان دووركەونەوە؟

چی : ناتوانین هەر هیچ نەبێ شوێنەوارێکی تێ جێ بێڵین؟
چی : هەموو شتێ بە سەرچێت ؟ هەتا هەتایە لە ناوچین ؟
ئەو رۆژگارانەی کە زەمان پێی داین و لێی سرییەوە
چیتر پێسمان نابەخشێتەوە ؟

نەمریو نەمان و رابوردوو ، رۆچونە تاریکەکان
ئایاچ دەکەن لەو رۆژگارانەی قووتتان دا ؟
دەبدوێن : ئاخۆ ئەو جۆشە مەزنانەمان
پێ نابەخشنەوە ، کە لێمانتان رفان ؟

ئای ئەی دەریاچە : ئەی گاشە بەردە لاڵەکان ! ئەی دارستانە
تاریکەکان !

ئێوە کە زەمان لێی گەراون یا دەتوانێ لاویتان نوێ کاتەوە ،
دەهیچ نەبێ یادگاری ئەم شەوە بپارێزن
تۆ ئەی سروشتی جوان بیپارێزە !

دەبا لەو ساتەدا بێ کە هێمنیت ، یا لە نێو رەشەباکانتا بی
ئەی دەریاچەی جوان ، با لە نێو دیمەنی گردۆڵکە دەم بە
خەندەکانتا بێ
لە نێو ئەو سنۆبەرە رەش و بەردەشاخە کێوی یانەدا بێ
کە بە سەر ئاوەکانتا شۆر بوونەتەوە !

با لە نێو ئەو بایەدا بێت کە دەلەرزێو تێپەر دەبێ !
لە نێو هاژەی کەنارەکانتا بێت کە لە کەنارەکانتا دووبارە
دەبنەوە ،
دەبا لە نێو ئەو مانگە ناوچەوان زیوینەدا بێ
کە بە تیشکی نەرمۆڵە رووی تۆ سپی دەکاتەوە !

خۆزیا ئەو بایەی کە دەنووزێتەوە ئەو قەمیشەی کە دەناڵێنێ
خۆزیا بۆنە سووکەکانی گیانی بۆندارت ،
خۆزیا هەموو ئەوەی گوێمان لێی دەبێو دەیبیسین و هەستی
پێ دەکەین ،
هەموو بیانووتایە «یەکتریان خۆش ویست !» .

تێبینی - ووشەی «زەمان» لەبری ووشەی «کات» بە کارهێزاوە

# دیالێکتی «گۆران» و شاعیروشیعرو نووسراو

★ هاشم کاکەیی ★

وەکوو ئەزانیین. . دەست پێ کردنی ئەدەبی کلاسیکی کوردی، بە دیالێکتی (گۆران) بوو، ئەویش ئەگەرێتەوە بۆ ئەمارەتی (ئەردەڵان) کە (بابا ئەردەڵان). . لەسەدەی چواردەدا دروستی کرد، وەکە دووبارە وولاتی شارەزووری ئاوەدان کردەوە کردی بە پایتەختی ئەمارەتەکەی. . کە مەغۆلییەکان وێرانیان کردبوو، لەبەر ئەم هۆیەش بوو کە (گۆران)کان، لە ڕۆژهەڵاتی چیاکانی زاگرۆزەوە کۆچیان کرد بۆ شارەزوور، وە دیالێکتی گۆرانیان بۆ قسەپێ کردن هەڵبژارد. تیرەکانی دانیشتوانی دەوروبەری ڕووباری سیروان، وەکو: زەنگنەوجەباریوشوان وبیبانیوتاڵەبانی. . لەو تیرانەن کە ئەدەبی کلاسیکی نەتەوەییان بە شێوەی (گۆران) هەبووە، بەڵام (دیالیکتی خوارووی) لە سایەی ئەمارەتی سلێمانیدا. : خۆی بەسەر ئەوشێوە زمانانە سەپاند وەگەرچی جیاوازیەکی بچووك لەنێوان دیالیکتە گۆرانەکاندا هەبووە. . بەڵام هیچ کاتێ کاری نەکردۆتە سەر زمانەکە، بۆنموونە: ئەوانەی کە بەم دیالیکتە دیسان قسەیان دەکرد وەکوو: هەورامیوکاکەییوباجەڵانیوشەبەك وشێخان. هەرچەندە ئەم دیالیکتە پەك کەوت لە بەکارهێنان، بەڵام ئەدەبێکی ڕاستەقینەوڕەسەنی بۆکورد بەجێهێشت کە جێگای شانازیوسەربەرزیمانە هەتا. . هەتایە بەگوێرەی سەرچاوەکان وا دەگەێنن. . کە یەکەم کەسێ بە دیالیکتی (گۆران) شیعری ووتوە (مەلاپەرێشان) ناوێك بووە کە لەنیوەی دوومی سەدەی چواردەو، نیوەی یەکەمی سەدەی پازدە بووە، ئەم (مەلاپەریشانە). . ناوی (محمد)وخەڵکی شاری (دینور)بووە لە ناوچەی کرماشان و دیوانێکی شیعری هەیە.

وە شاعیری سەدەی هەژدە (خان ئەڵماس)بووە، کە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا. . نوسراوە لە ساڵی [1762ز/1177ك] لە نوسینی (نادر نامە) بووەتەوە. خان ئەڵماس. . خەڵکی گوندی (گەندوڵە)ی کوردستانی ئێران بوومزۆرجار ڕوویەڕووی دارو دەستەی پاشایەتی بوگەتی ئێران بۆتەوەو، هانی خەڵکی کوردستانی بەشەرەفی داوە. . کە شۆرش بەرپاکەن، بۆوەرگرتنی مافی ڕەوای خۆیان. . بۆیە زۆر جار گیراوەو بەندیان کردوە، وەکوو لەم شیعرەیا دیارە، کە بەرێز (شەماڵی) هاوڕێم بۆی ناردووم.

یاران دوستاخم



یاران دوستاخم ، یاران دوستاخم
چه شاری تاران ، یاران دوستاخم
هامراز مەینەت ، شەریك ئاخم
بەرگم قەلاخەن ، پەی یاران داخم
تو فەیل خەمناك ، شاری تارانم
گیروەردەی زنجیر ، شاهی ئێرانم
بێ کەس و بێ وەر ، بێ یارو یاوەر
غەریب و بێ کەس ، چەئێل دەربەدەر
چەسوب تابەشام ، گرینەن خدێم
ئاوات مەوازۆم ، من وەمەرگی وێم
پەشێوو ماتم ، دەرونم زارەن
مەحبوسو مەئیوس ، بەرگم دەوارەن
پەی دووری وولات ، خاتر خەمینم
خوراو بەرمەشۆ ، سەییل ئەسرینم
غەریب نەگۆشەی ، کونجی شارانم
ئینتزار وە دین ، دیدەی یارانم
(سنە) نشینان ، بنیشن وەشاد
غەریب تاران ، بکەران وە یاد
هەرکەسێ واچۆ ، کە تاران خاسەن!
راست ماچو ئەمما ، (ئەلماس) کەساسەن!
مەر هەر خوداوەند ، کارسازی کاران
ئێمەیش بەرکەرو ، چەشاری تاران
من و دەماوەند ، شەرتێمان کەردەن
ئەو تەم بۆمن خەم ، تاوەرۆی مەردەن
یاران هامسەران ، قەومان و خوێشان؟!
هەرگیز چەوبۆنە ، جەورم نەکێشان!
ئینە گشت کەردەی ، کاری گەردونەن
کەس نمەزانۆ ، حالی من چوونەن!
یە (ئەلماس) واتەن ، چە تاران دوستاخ
پەی دووری یاران ، هەمەکێشو ئاخ!

★ ★ ★

وە شاعیرانی . . سەدەی نوزدەو سەرەتای سەدەی بیستەم ، ئەمانە بوون :ـ

1 ـ میر محەمەد صالح نعمة اللهي [1834 ـ 1905ز] کە نازناوی بە (حەیران شاه عەلی) پەیدا کردوە ، لە سالی

[1250ك / 1834ز] له (مـايـەدەشت) . . سەر بە كرمـاشان لەدايـك بووە، وە لەسـالّـى [1323ك / 1905ز] مردوە. خاوەنى گەلىّ نووسـراوى شانـامـەوداستـان وشيعـرى ئاينى بووە، وەكـو (حقيقت نامـه)و(جمجمـه سلطـان)و(حسن و حسين) . من لەوبڕوايـەم ئەم كە شكـۆڵە شانامايەى كە لە لام پارێـزراوەو ناوى [شـانـامـەى حەسـەن و حوسين]ە لە سەر دەسنـووسى (نعمةاللهى) ڕەنووس كراوە. ئەمەيش زانياريەك پێشكەش بە خوێنەرى بەڕێزى گۆشەى كەلەپوور. . دەربارەى كەشكۆڵەكەى (حسن و حسين)ى پارێزراوى لاى من :

كەشكـۆڵـەكـە بە قومـاشێكى . . قەديفـەى ڕەنـگ شين ڕووگيـركـراوە، قەبـارەكەى [20 × 15 سم]ە، پێك هاتووە لە [124] لاپەڕە. لاپەڕەى يەكەم تێيدا نووسراوە . . (هذا كتاب حسن وحسين)، وەلـە ديـوێكى لاپـەڕەى دووهـەم نووسراوە (كتبت هذه الأشعـار في يوم الاربعـاء المصـادف [4/ 1/ 1956] الميـلاديـة، المـوافق للسنـه الهجـريـة 1376 هجـرى . . كاتب الاشعـار وادي أمين الكـاكـەيى) . وە لە ديوەكەى هەمان لاپەڕەدا نووسراوە بەجوانى (بسم الله الرحمن الرحيم)، (نصر من الله وفتح قريب) .

لە لاپەڕە ژمارە دانراوى [1] لە سەرەوە نووسراوە : (هذا كتاب حسن وحسين ابن علي المرتضى كرم الله وجهه ورضى الله عنهم) . ئەمجـا دەست پىّ دەكـات وبەشيعـرى دياليكتى (گۆران)وە دەڵىّ :

ئيبتدا بەنام، پادشاى عەليمَ
واحدى بەر هەق، غەفوورو ڕەحيم
قەيوم قەهار، قايم قەديم
داناى ذوالجلال، سەميع وعەليم
قادر قودرەت، كارسازى كاران
قەرار دادەى سونع، سان و ستاران
فيداى نامت بام، ذات ذو الجلال
ئاگاهـ داربرج، ڕۆزو ماهو ساڵ (هتد . . . )

لەم لاپـەڕەيـەدا هەژدە دێـر شيعـر نووسـراوەتەوە، بەلاَم لە لاپـەڕە ژمـارە [2] تا [6]، بيست دێـر شيعـر لەهـەر يەكـەيان نووسراوەتەوە، وە لە لاپەڕە [7] تا [110]، دە دێر شيعر لە هەر لاپەڕەيەكيا نووسراوە . . وە كۆتايى كەشكۆڵەكە بەم چەند دێرە دێت :

عەفوو كەر گوناى، مەجليس ئەحباب
كاتب وساميع، قارئي كيتاب
سەيدى سادات، نوور كائينات
بەر محەمەد بۆ، سەلام و صەلەوات .

وە لە خوارەوەيش ئەم نووسراوەيە هەيە . . (تمت و مهرشد در شهـر كانـون الثـاني الموافق يوم الثلاثاء 17/ 1/ 1956 ميلاديه . . كاتب الأشعار وادي أمين الكاكەيى) .

بەڕاستى دەسخەتى نووسەر ناسك و دڵ گيرە . . وە لە نووسينا شارەزا بووە، بۆيـە وا ڕوخسـارى نوسـراوەكـەى جوانـە . ئەم شانـامـەيـە بۆباوكم نووسراوە . . ئەتوانم بڵێم هەر ئەمە بوو بە هۆى شارەزابـوونى لە خوێنـدنى تێكستى كوردى، زۆرجـار بەدەنگى بەرز ئەيخوێندەوە بۆمان .

دەسنـــووسێكى ترى (نيعمـــة اللهى) هەيـە بە ناونيشـانى (جمجمە سوڵطان) . . لە كتێبخانەى ميرى لەشارى ماربۆرك ـ بەرلين دا پارێزراوە، [60] لاپەڕەيە .

2 ـ دەروێش نەورۆز . . يان (ميرنەورۆزى لورى) :

يەكێكـە لە شاعيرە پايە بەرزەكانى كوردستانى ئێران، وە كە بە ديـاليكتى (گـۆران) شيعـرى هۆنيوەتەوە . . نەورۆز لە گوندى (سـۆران)ى سەر بە ناوچـەى سنجـاوى . . وە لە بنـەمـاڵـەى (گومنام)، لە ساڵى [1260ك / 1844ز] هاتۆتە دنياوە . ئەم پايــە بەرزە خوانـاسـە . . كە سوتـاوى تاوى هەتـاوى سۆفى گەرێتى بووە گەلى هۆنـراوەى ئاينى هۆنيـوەتـەوە وە زۆر ڕستەو ووشەى ڕەنگاو ڕەنگى خوايى ويەزدانى نەخشاندوە، شاعيرى ناوبـراو هەنـدێ جاريش گۆرانى بە شيعرەوە ووتوە . . ئەم زاتە هاتـووچـۆى كوردستـانى عيـراقى كردوە، شارو گونـدەكـانى گەڕاوە . . بەلاَم ڕوونـاك نىيـە كەى دوا هەنـاسـەى لە ژيـان هەڵمژيوەو كۆچى دوايى كردوە .

ئەمـەيش نمـوونـەى دووپارچە هۆنراوەيەتى، كە يەكەميان بەشـان و بالآوپێنـوسى خۆيـو . . بە دەنـگ و ناوو شانـامەى خۆيـدا وتـوويەتى، وە لە پارچە شيعريى دووهەما ديارە گلەيى لە دەست پيـرى وبىّ هـاذى خۆى ئەكـاو ئەڵىّ : پێشتـر چۆن بووم، ئێستاش چۆنم !

ـ 1 ـ

دانەى فەرەنگى شـەهر ئەرژەنگم
ئەگشت مەسكەنىّ مەخيزۆ دەنگم !

دانەی فەرەنگی شەهر مەحاڵم
نە گشت مەسکەنیٚ مەخیٚزۆقاڵم!
دانەی فەرەنگی شەهر ئەبجەدم
نەگشت مەسکەنیٚ مەوانان خەتم!
دانەی فەرەنگی شەهر مەفرووزم
نەگشت مەسکەنیٚ دەنگ نەودووزم!

- 2 -

نەمەندەن تاقەت ڕاگەی ڕارەوم
یورتمو ییلفار چوارتایی دەوم
کوهنەی قەدەم کش پیٚشتر وەشەوم
چابك چالاك جاز مارەی لۆك بیم
چالاك و چەپر نەزای نەزۆك بیم
سەرکەش، زۆرەمل، قەڵەت قیرەگن
یاڵ دەم ڕیٚزیای پیٚشتەر ساحیٚب سن
ئیسا لق وەلق تیرە سست و سس
چوین ڕوی ڕوتبازمورغی خانە فس
لاکم لاکەنتە ڕانم ڕتوبەت
دەستم کز ئەنداز ئەندازەی قوەت
یەگشت تەمام بی‌لوا وە ڕاوە
گاهـ وە ناز تەور گاهـ وە دماوە

★ ★ ★

3 - تەیمور قولی :

ناوی «تـەمـمـور»و کوری «رەزا»ی کوری «عـەلی»یـە، لە گونـدی (بـان یاران)ی کوردستـانی ئیٚران لە دایك بووە بەڵام ساڵی لە دایك بوونی بە تەواوی نازانریٚ.

تەیمور شاعریٚکی بەرزی ئایینی بووە. . هۆنراوەکانی بەرزن و واتـادارن، وە پڕن لە وشـەی ستـایش و سوفیەتی‌و یەزدانی، تەیمـور. . وەك نەورۆزی شاعیـر، مامـۆستا بووە لە چۆنیەتی بەکـار هیٚنانی ووشە و ڕستەی دیالیکتی (گۆران) تەیمور گەلیٚ جار تووشی ئازارو ئەشکـەنجـەی بەندیخانەکانی ئیٚران بووە، زۆرجـار بەنـد کراوە. . تا دوایین جاریٚ کە ئەیگرن، حاکمی گشتی کرماشان لە ساڵی [1268ك / 1852ز] لە سیٚدارەی ئەدا.

لیٚرەدا پارچە هۆنراوەیەکی تەیمور ئەنوسمەوە کە لەیەکیٚك لە بەندیخانەکانی ئیٚراندا فەرموویەتی، ئەمەیش پارچە هۆنراوەکەیە :

تاك تەنیا فەرد :

واحید ئەحەد تاك تەنیا فەرد
فەردی بیٚ هەمتا، نەزادو نە مەرد
کەنندەی نەقاش، چەرخی لاجەوەرد
نە تەنیای [حەبس]، عەزابم سەختەن
ئەسرم چون ڕیٚزان، بەرگ درەختەن
خوایە! تو ئەمیر، لامەکانەنی
تو خەزانەی سرڕ کەس نەزانەنی
تو ساحیٚب ئەرزو ئاسمانەنی
تو خالیق خەڵك و سفید خوانەنی
هەرچەند عەزابم، نەحەد بیٚشوەن
بەڵام! ئومیٚدم، تەمام وە تووەن
بیٚدار نەخواو، پادشای بەختم
گوشاد کەر کلید، قاپی نەتەختم
[تەیمور]م دووچار، عەزاب سەختم
چەمەڕای کەرەم، تیٚیدا وەجەختم

★ ★ ★

- سەرچاوەو پەراوێزەکان -

★ سوودم لە باسیٚکی دکتـۆر مارف خەزنەدار بە ناوونیشانی ( الشعر الدینی في اللهجه الگورانیه الکردیة ) وەرگرتووە براوانە گۆڤاری (الثقافة الجدیدة)ی ژمارە (93) ساڵی 1977 .

★ دەسنووسیٚکی کۆن بەناوی (شانامەی حەسن وحوسیٚن).

★ بروانە چەند دەسنوسیٚکی کوردی . . سردارمیرن (گوڤاری کاروان)ی ژمارە (3) ساڵی (1982).

★ سوودم لە کتیـٚبیٚکی (فـارسی) کۆن وەرگـرتــووە بەڵام ناوونیشانی نەمابوو . . ببوورن .

★ ئەوشیعـرەی (خـان ئەڵمـاس) . . لەمیـژ بوویٚم گەیشتبوو . . لەیـەکیٚ لە گوڤـارە کوردیەکان بڵاوکراوەتەوە لیٚردا وا منیش دووبـارە بڵاوی دەکـەمـەوە لەبـەر ئەوەی پەیوەندی بەباسەکەوە هەیە

دمی وەشاند ـ دوو ئەمسەرو ئەوسەری
تری کردو رمیەکی تریشی لەقەڵایچەدا
، هاواری کردە پاشا ووتی « ئەی پاشا
ئیستا خاکت بە توورەکە ئەبێژم ـ دوو
خزمتکارم هەیە لات ـ ئەمە وێتەوە . »

پاشا سەری سورما لە سواری رەش
سوار لە جوانـی و رێـك و پێـكی ،
یەکسـەر دڵی گرتی و ووتی :ـ خۆزگـە
ئەم سوارەیـان کورم دەبـوو ، یان زاوام
دەبـوو ، یان ئامـۆزام دەبـوو « دیسان ـ
ئەحـمـەد ـ هاواری لەپـاشـا کردو ووتی
:« پاشـا بەزووتـریـن کات . دوو
خزمتکـارەکەم بدەرێ ، ئەگینا خراپت
بەسەر دێنم » .

پاشـا ووتـی :« ئەی رەش سوار .
ناونیشانی ئەو دوو خزمتکارەت چی یە
؟»

ـ ئەحـمـەد ـ ووتـی « سەروموڕ وا بە
پشتیانە » .

پاشـا دوای پشکنینی هەمـوو خەڵکی
شارەکـە ـ کەسـی نەدۆزیـەوە ـ ئەو
ناونیشـانـەی تیـابێ ـ کەسیش نەمـاوە
تەنهـا دوو وەزیـر نەبێ ـ کاتێ سەیـری
پشتی دوو وەزیـر دەکات ـ سەروموڕی
پێوەیە . .

پاشـا هەردوو وەزیـر تەسـلیم بە «
ئەحمـەد» دەکـات ـ ئەوسـا پاشـا بە
ئەحمەد دەڵی « رەش سوار تۆکێت ولە
کوێرە هاتووی »

ـ ئەحمەد ـ دەڵێ « دەزانی من کێم » .

پاشا دەڵێ « نەخێر شێوەتم نەدیوە » .

ئەحـمـەد دەڵێ « منت شوانی قازەکانی
ئێـوەم ، من کورە کەچەڵە شێتەکەبووم
، من هاوسەری کچە بچکۆلەی تۆم .
بەڵام من بەغـریبی رێم کەوتـۆتـە ئێرەو
بووم بە کوڕی ئەوپیـرێژنە ـ من کوڕی
فلان پاشـام لەفـلان شار پاشـا تۆ پێت
شوورەیی بووژنت دابە من ، هەروەها
پێت ناخـۆش بوو کە من گوڕ ـ ەکەم بۆ
کوشتبـووی و چاوت چاك بۆتەوە ـ هیچ
نرخێکت بۆهەولـدانـەکـەم دانـەنا ـ ،
بەڵام پێت شورەیی نی یە کە ژنت داوە
بەم دوو خزمتکـارەم ـ بەڵام باش بزانـە
ئەوە کچـە بچکـۆلەکەتە کە بۆ دووساڵ
دەچێ لای منە ـ کە هێشتا هەر کچە ،
توخنی نەکـەوتووم ـ زۆر زۆر بەرێـزەوە
بەدڵێکی خۆشـەویسـتەوە ئەم دەیتێ ـ
ئەموێ » .

پاشـا بە بیستنی ئەم قسـانـە زۆر
سەرسام بوو ، هاتەپێشەوە لە ـ ئەحمەد
ـ و ناوچـەوانـی ماچ کردو ، داوای
بەخشینی لێ کرد . .

پاشا ـ بانگ دەکات دەڵێ :« بیدەن لە
دەهـۆڵ و زورنـاو ـ شایی گەرم بکەن ـ
خەڵکی هەموو شار بانگ بکەن . . » .

پاش چەنـد رۆژ یـك . . ئەحمـەد بە
پاشـا رادەگەینێ : کە دەیەوێ بچێتەوە
. . . ماڵی باوکی وشارەکەی . .

پاشـا داخوازی دەکا : کەصەد سواری
چەك بە دەست لەگەڵیا بکەونە رێ . .
کاروان رێك دەخرێ بە هەموو شتێکی
پێویستیەوە پێشەواوسەر کەردەی کاروان
. . تەنها سێ کەس بوون :« ئەحمەد
، کچە بچکۆلە ـ پیرێژ ن » .

تامردن بە خۆشی‌وبەختیاری :
ژ یانیان بەسەر بەرد

چەپکێ گوڵ چەپکێ نێرگز
مەرگتـان نەبینم هەرگیـزاو هەرگیـز

* صدام حسین نیشانەی هێزو
بنیادنەری سەر بلندیو سەرۆکمانە
لەسەرەرێی سەرکەوتنا

* بەناوی (صدام)ەوە دەجەنگین وبەناوی
ئەوەوەش سەرئەکەوین

«نـا . . نا، هەرگیـز کاریوا ناکەم . . یەکجاری وازی لێـدێنم . بۆ خەڵـك و خوای‌تـر مایـەی شادیو خۆشیو پێکـەنینـەو بۆ خۆشم مایـەی ئازاروژان و دەردە سەری . . هەرگیز . . هەرگیز» .

داود ئەو قسانەی لە ژێر لێوەوە دەکردن و گۆچانە کورتە زەردبـاوەکـەی لە زەوی دەکـوتاو بەناراحەتی ڕێی دەکردو بەچاکی خۆی پێ ڕانەدەگیرا . دەموچاوە پانەکەی بە سەر سینگـە دەرپـەڕیـوەکـەیـدا ، لە نێوان هەردوو شانە لاوازو باریکەڵەکانیەوە ڕۆچووبوو. لەپێشەوە ڕەنگ و ڕواژ ایەکی ووشـك و ڕەق و ناشیـرینی هەبـوو: دوولێـوی تەنکی درێـژکـۆڵـە ، دووبرۆی کەوانـی باریـك ، برژۆڵـی بەسـەریـەکـدا کەوتـوو، ڕەنـگ زەرد ، سەروسـەکوتێکی ڕەقـەڵـە . . جگـە لە مانـەش کە لە دوورەوە تەمـاشـات دەکـرد . . پەستەکی بەریو دەستە درێژە باریکەکانیو ئەو کڵاوە پان و پۆڕەی کە بەسـەری خۆیـدا کردبـوو و بە تایبەتیش ئەو پۆزو ئیفادەی لە ڕۆیشتنیا لێیدەداو گۆچان کوتانە خێرا خێراکەی هێندەی دیکەیان سەیرترکردبوو.

لە سەرپێچی شەقـامێکـەوە بەرەو دەروازەی دەوڵـەت ملی لە شەقامی دەرەوەی شار نابوو. دەمەو خۆر ئاوا هەوا نەختێـك گەرم ، دەستی چەپی کردبـووە لەمپەری تیشکی خۆرەتـاوەکـە . دیـوارە قوڕەکـان وکـۆمـەڵە خشتە پەرت و بڵاوەکـان مات و بێـدەنگ سەریان بە ئاسمانەوە نابوو. لە بەری ڕاستی ئەوخەنـدەکـەی تازەیـان پڕ کردبـۆوە ، ناو بەناوێك ئەو خانووە نیوە تەواوکراوانە دەبینران کە بەخشتی سوور هەڵچنرابـوون . ئێـرەکـانە چۆڵ بوو. ناوبەناوێك نەبایە ، ئۆتۆمبێلێك یان عەرەبانەیەك ، تەپوتۆزێکی لەوگڵە ئاوڕشێن کراوە هەستاندبایە، دەنا هیچی تری پێدا نەدەهات .



# داوده کوور

نووسینی : صادقی هیدایەت

وەرگێری : غەریب پژدەری

هەردووبەری شەقامەکەشیان بە نەمامی تازە لەدەم جۆگاکەوە ناشتبوون.

کە بیری دەکردەوە، دەهاتەوە یادی، کە هەر لە منداڵیەوە تا ئێستای هەمیشە، یا گاڵتەجاری ئەموئەو. . یا هۆی بەزەیی پێداهاتنەوەیان بووە. ئەو ڕۆژەی وە بیرهاتەوە کە لە وانەی مێژ وودا مامۆستا ووتی . . دانیشتوانی (ئەسپارتە) منداڵی شەت وگێر وسەقەتیان دەکوشت ولە ناویان دەبردن، وهەموو منداڵەکان ڕوویان بە لای ئەودا وەرگێڕاو تەماشایان کردو ئەویش تێکرابوو. بەڵام ئێستا حەزی دەکرد ئەو یاسایە لە هەموو جیهاندا لەکاردابایەو یان هەر نەبایە وەك زۆر جێگای تر نەیان هێشتبایە مرۆڤی شەت وگێروپەك کەوتە ژن ومێردایەتیان کردبایە. چونکە دەیزانی ئەمە هەمووی گوناهی باوکیەتی . ڕەنگی زەرد، دەموچاوێکی ڕەقەڵە، دووچاوی کوێرە مووشەوبە قوولداچوو، دەمێکی نیوە داپچراو، کاتی مردنی باوکی، کە بۆخۆی دیبووی، ئەمانەی هەمووهاتنەوە پێش چاو. باوکێکی پیری یەك کەوتە، کە ژنێکی خان ومان و جوانی هێنابوو. . . بەڵام هەموو منداڵەکانی وەك خۆی گۆج وئیفلیج وشەل وگێر وسەقەت لێ ببوون، هەر برایەکی لاڵ وگێلۆکەی مابوو، ئەویش دوو ساڵ لەمەوپێش مرد. زۆر جاران لە دڵی خۆیدا دەیگوت : «خۆزگەم بە خۆیان کات. . ئەوان خوا دایێ!».

بەڵام ئەو مایەوە و نەمرد. لە خۆی ولە هەموو خەڵکی بێزاربووو کەسیشی لێ نزیك نەدەکەوتەوە، بەڵام ئەو بەژیانی تەنیایی ڕاهاتبوو. لە سەردەمی منداڵی و قوتابخانەشیدا، لە وەرزش وگەمەو گاڵتەو ڕاوڕاوێن و تۆپێن و سێبازو هەموو ئەوجۆرە شتانەی، کە مایەی خۆشی وشادی هاوتەمەنەکانی بوون، ئەولێیان ناکام



بوو. لەکاتی یاریدا ئەوخۆی مات دەکردو لە سووچێکی حەوشەی قوتابخانەدا کتێبێکی بە بەرچاوی خۆیەوە دەناو بەدزیەوە لە پشت کتێبەکەوە لە منداڵەکان ڕادەما. بەڵام لەلایەکی ترەوە بە ڕاشکاویەوە تێدەکۆشا و دەیویست هەر نەبێ لە ڕێی خوێندنەوە پێشەبریان بداتەوە. شەووڕۆژ هەوڵی دەدا. هەربۆیەش یەك دوو قوتابی گەمژەو تەمبەڵ و تەوەزەل هەبوون هەرگیز لێی جیا نەدەبوونەوە، ئەوەش هەر بۆ ئەوەی هێندێك ڕاهێنانی بیرکاری‌و ئەرکی نووسینەوەیان لەبەر دەفتەرەکەی ئەو بنووسنەوە. بۆخۆشی دەیزانی دۆستایەتیەکەی ئەوانە درۆیەو هەر بۆمەبەست و سوودی خۆیانە، دەنا یەکێکی وەك «حەسەن خان» ڕێك وپێك وجوان وپۆشتەوپەرداخت، کە قوتابییەکان خواخوایان بوو ببنە هاوڕێی. . چی لەو داوە؟

دوو سێ مامۆستاش هەبوون کە هەر بە ڕووالەت جارجارە دڵنەواییان دەکرد، ئەوەش نەك لەبەر زیرەکیەکەی بەڵکە بەزەییان پێدا دەهاتەوە. لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و کۆشش و تێکۆشانەشیدا قوتابخانەی هەر پێ تەواو نەکرا.

ئێستاش هەژار کەوتووە. هەموو کەسیشی لێ دوورە پەرێزو بێزارە. ئەو دەمیش هاواڵەکانی شەرمیان پێدەهات لە گەڵی بەڕێیەدا برۆن وپیاسەی لەگەڵدا بکەن. ژنانیش پێیان دەگوت «کوورە».

ئەم ووتەیە لە پێستی خۆی دەرداویشت. چەند ساڵێك لەمەوبەر دووجاری خوازبێنی ژنی کردبوو. هەر دووجاران ژنەکان گاڵتەیان پێ هاتبوویە. ڕێکەوت ماڵی یەکێك لەو ژنانە. کە (زیبا) بوو لەو نزیکانەو لە گەرەکی فیشەراوا بوو. چەند جارێکیان یەکتریان دیتبوو و لەگەڵ یەکدا دوابوون. ئێواران کە لە قوتابخانە دەهاتەوە، سەرێکی لەوێ هەردەدا تابیبینێ. ئەوەشی هەر لەبیرمابوو کە خاڵێکی ڕەشی بە لێوەوەیە. دواییش کە پووری ناردە خوازبێنیەی، هەر ئەو کچە گاڵتەی پێ هاتبوویەو گوتبووی: «بۆپیاو قاتییە من مێرد بە کوورەی بکەم؟» چەندی دایك و باوکی کچە لەگەڵیان کردبوو و لێیان دابوو بێ سوود ڕازی هەر نەبوو و وتبووی: «بۆ پیاو براون؟».

بەڵام داود ئێستاش هەر خۆشی دەویست و ئەمەشی خۆشترین بیرەوەرییەکی سەردەمی لاویەتیەتی‌و ئێستاش جارجارە کە لەوێوە تێدەپەڕێ یادگارە ڕابووردووەکانی دوێنێی دێنەوە بەرچاوی. ئەووازی لە هەموو شتێك هێنابوو. زوربەی کاتی بە تەنیا دەگەڕاو لە خەڵکی دوور دەکەوتەوە. چونکە هەرکەسێ پێکەنیبایەو یا لەگەڵ ئاواڵەکەیدا چپەیەکیان کردبایە، ئەووایدەزانی لەگەڵ ئەویانە. بە چاوە ڕەشە زەقەکانی و ئەو لەش ولارە چەپ و چیرەیەوە، بە زەحمەت خۆی وەردەسوڕاندو لە ژێرەوە بەخێسەیەکەوە دەیڕوانی و تێدەپەڕی. . . لە ڕێبازێدا هەموو هەست و هۆشی بەلای ئەم و ئەوەوەبوو، ماسولکەکانی دەموچاوی هەموو گرژدەبوون و دەیویست بیروڕای خەڵکی دەربارەی خۆی بزانێ.

لەسەرخۆ بە کەناری جۆگایەکەدا ڕادەبووردو جاروباریش بە نووکی گۆچانەکەی ڕووی ئاوەکەی دەشڵەقاند، بیری پەرت و ئاڵۆزبوو.

سەگێکی سپی تووك درێژی چاوکرد، بە دەنگی گۆچانەکەی، کە وەبەردی کەوت سەری، بڵندکردو تێی هەڵڕوانی. وەك نەخۆشێکی سەردەمی گیانەلا، لەجێی خۆیەوە تەکانێکی داو سەری بەربۆوە سەرزەوییەکە، بەناڕاحەتیەوە بەسەریدا چەمیەوە، لەژێر تریفەی مانگە شەوەکەدا سەرنجیان تێك ئاڵا، بیرێکی سەیری مێشکیداهات، هەستی کرد کە ئەمە یەکەم سەرنجی سادەو ساکارو ڕاستەقینەیە لە ژیانیدا دیبێتی،

لە کاتێکا کە هەردووکیان بەدبەخت وچارەڕەش و وەك شتێکی زۆر بێ نرخ لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی وەدەرنراون. ویستی بەتەنیشت ئەو سەگەی کە کوێرەوەرییەکانی خۆی پەلکێشی ئەم دەرەوەی شارە کردووەو لە خەڵکی شاردۆتەوە، دانیشێت و بینێتە کۆش و باوەشییەوەو سەری بەسینگە زەقەکەی خۆیەوە بنووسێنێ. بەڵام وای بەبیرداهات، ئەگەر کەسێ لەوێوە تێپەڕێ‌و چاوی پێی بکەوێ هێندەی دیکەشی وەبەرتیرو توانج و تانەو تەشەران دەدەن.

زەردە پەربوو کە لە دەروازەی (یوسفاوا) تێپەڕی.

چاوی بریە خەرمانەی ئەو مانگەی لەو دەمی بولێڵە غەمناکەدا لە گۆمی شینی ئاسماندا مەلەی دەکرد. خانووە نیوە تەواو کراوو کۆمەڵە خشتە پەرت و بڵاوەکان و دیمەنی خەواڵووی شارو درەختە بەرزەکانی ماڵان، سەریان نابوو بە بەرۆکی ئاسمانەوە. تارمایی پەردەی خۆڵەمێش ڕەنگی بە بەرچاواندا دەهات و دەچوو. دووروونزیك کەسێك دیار نەبوو. دەنگی نزم و دووری (ئەبوعەتا) لەولاوەی خەندەکەکەوە دەهات. بە زەحمەت سەری بڵندکرد. ماندووبوو، غەم و کوێرەوەریو چاوە سوور هەڵگەڕاوەکانی ئەوەیان دەنواند، کە سەری خۆی ناتوانێ.

داود گۆچانەکەی لە کەنار جوگەلەکەوە داناو پەریەوەو چوو لەسەر بەردەکانی ئەو بەری قەراغ شەقامەکە دانیشت. لەپڕ هەستی کرد ژنێکی چارشێو بەسەر لە کەنار جوگەلەکەوە لە تەنیشتیەوە دانیشت، دڵی کەوتە پەلە. ژنە بێ هیچ پێشەدەستیەك ئاوڕی دایەوەو بە زەردەخەیە کەوە ووتی: -

هۆشەنگ..! ئەوە تا ئێستا لە کوێ بووی؟.

داود سەری لەدەنگە سادەو ناسکەکەی ئەو ژنە سوڕما کە چۆنە ئەوی دیتووەو نەسڵەمیوەتەوە؟!. وەك هەموو دنیایان دابێتێ. پرسیارەکەی وا پێدەچوو دەیەوێ بیدوێنێ. بەڵام بەم شەوە چدەکا لێرە؟ دەبێ لەوانە نەبێ؟ بەڵکە ئەویندار بێت! هەرچی هەیە... قیروسیا، خۆ هەر نەبێ هاودەمێکی قسانم وەگیر کەوتووە! دڵی خۆمی پێ بدەمەوە!. وەك زمانی بەدەست خۆی نەبێ ووتی:

خاتوون بە تەنێی؟ خۆمنیش تەنیام، هەمیشە تەنیا! هەموو ژیانم هەر تەنیا بووم.

هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوون کە ژنە چاوێلکە ڕەش لە چاوەکە دووبارە لای لێکردەوە و ووتی: - بۆ تۆ کێیت؟ من وامزانی هۆشەنگە، چونکە هەر کاتێ کە دێت دەیەوێ گەنجەفێکم پێ بکات.

داود لەو قسەی ئەم دوایە هیچی وای دەستگیر نەبوو و لە مەبەستی ئەو ژنە نەگەیشت. هەروەها چاوەڕوانی ئەمەش نەبوو. دەمێك بوو هیچ ژنێك قسەی لەگەڵ نەکردبوو، زانی ژنە جوانە.. هەموو لەشی وەسەر ئاوگەرا، بە ئەستەمەوە ووتی:

نا.. خاتوون، من هۆشەنگ نیم، من ناوم داودە.

ژنەکە بەزەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دایەوە: خۆ من تۆ نابینم.

چاوم دێشێ! ئەها.. داود!... داودە کوور... (لێوی خۆی گەزی) دەمزانی ئەو دەنگە بە گوێم ئاشنایە. منیش (زێبا)م دەمنا سییەوە؟.

بسکە بژەکانی کە لاروومەتی داپۆشیبوو وەلاچوون. داود خاڵە ڕەشەکەی سەر لێوی ئەوی دیت، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێت، دڵۆپە ئارەقی بە سەرورویدا هاتنە خوارێ، دەوروبەری خۆی ڕوانی، کەس نەبوو. ئاوازی دەنگی (ئەبوعەتا) نزیك ببۆوە، دڵی لێیدەدا، بە جۆرێکی وای لێدەدا هەناسەی سوارکردبوو.

بێ ئەوەی هیچ بڵێ بەلەرزە لەرزەوە لەجێی خۆی هەستا، گریانی لە ئەوکێ مابوو، گۆچانەکەی ئاودایەوەو بەهەنگاوی هەڵەت و پەڵەت، لەوڕێیەی لێوەی هاتبوو گەڕایەوەو بەدەنگێکی گرەوە لە ژێر لێووەوە دەیگوت: «ئەوە زێبا بوومنی نەدەدیت. لەوانەیە هۆشەنگ دەستگیرانی بێت یامێردی.. کێ دەزانێ؟ نا... هەرگیز... دەبێ یەکجاری وازی لێ بێنم!... نا، نا من ئیدی ناتوانم...»

خۆی پەلکێش کرد تا گەیشتەوە لای ئەو سەگەی لەڕێی هاتنیا دیتبووی. دانیشت وسەری سەگەکەی بەسینگە دەرپەڕیوەکەی خۆیەوە نووساند. بەڵام سەگەکە مردبوو!.



# گوڵە کێوێلە

چیرۆکی : ئارسکین کالدوێل
گۆرینی لە ئینگلیزیەوە :
ش . عەبەکە

ئەومەلـەی بەدرێـژایی شەولەسەرلوتکەی سەربانەکە هەڵنیشتبـووکە دەنگی پڕلە ئاوازی هەوای فینکی شەوی پڕ کردبوولەگەڵ دەرکەوتنی خۆردا لە شەقەی باڵی دابوو. کێش وماتیـەکی قووڵی تا ئاشکـرای وەك وولاتە لماویی یە تەختەکە هەموو گۆشەیەکی گرتبۆوە. سیبەرەکانی دوێنێی سەرملە سپی یـەکـە لەژێـر درەختەکان وبەدەوری گەڵای لقەکان و تەڵەزمی پەریوی پەرژینەکەدا کەوتبوونە خۆ گردکردنەوە.

خۆریش بە قەڵـــەمبـــازوتـــەکـــان بەرەوژوورخۆی هەلئەکیشا هەروەکوپەلەی بیت سەر درەختە سنەوبەرەکان بکەویت و بەسەر وولاتە تەختەکەدا هەڵ بیت تا دەگاتە کەنداوەکە.

لەنـاوخانـوەکـەدا ژووری نوستنـەکە هێشتا رووناك و گەرم بوو. نیللی «Nellie» لەوکـاتـەوە کە مەلەکە فری بوو بە ئاگا هاتبوو. لەسەرلابۆی راکشابوو، دەستێکی لێ نابووە ژێـر سەری و دەستـەکـەی تریشی لەسـەر سەرینـەکـەی سەریـەوە ئالاندبوو. پێڵووی چاوی دەستی بەفرین کرد.



دوایی تا یەك دەقیقە هیچ جوولەی لێوە نەهات. دوای ئەوە دووبارە دەستی بەفرین کردەوە، حەوت، هەشت، نۆجار بەخێـرایی یەك لە دوای یەك. زۆر بە ئارامی و لەسـەر خۆیی‌یەوە چاوەروانیVern- ڤیرن ی دەکرد کە لەخەو هەلٚسیت.

کاتێـك «ڤیـرن» کە هەنـدیـك جار شەو زۆر درەنـگ بهـاتایەوە نیللی پەئاگا نەدەهێنا. «نیللی» پێش ئەوە شەوە تا لە توانـایـدا بوو بەدیـاریـەوە دانیشت و چاوەڕوانی هاتنـەوەی کرد بەلاّم لە دوایـیدا چاوەکانی وا قورس بوون کە ئیتر بۆی هەلٚ نەدەهات وخەوی پێداکەوت.

ئەوە سەر رەشەی سەرسەرینەکەی تەنیشتی ماندوو بێ تاقـەت دەینـوانـد، ناوچـەوانی «ڤیـرن» تەنـانـەت لە نووستـنیـشـدا لە سەروو لووتیـەوە چرچ و لۆچی تێ دەکـەوت. پێـستی دەوروپشتی گۆشـەکـانی چاوی لە شوینەکانی تری دەم وچاوی تاریکتر بوو. .

زۆر لەسـەر خۆو بەووردی «نیللی» لیێ نـزیـك بۆوەو روومەتی ماچ کرد زۆریش ئارەزووی لیێ بوو دەست بکاتە ملی و سەر بنووسێنێت بە خۆیەوەو جار لەدوای جار ماچی بکات.

جارێـکـی تریش پێـلۆی چاوی کەوتـە فریـنـێـکـی بێ ئەندازە زۆر بەنەرمی چرپاندی «ڤیرن، ڤیرن».

بە هێواش چاوەکانی لێك ترازان و دووبارەلێکی نانەوە «نیللی» وورتـەیـەکی بۆ کرد ووتی «ڤیـرن، گیـانەکەم» دلٚیش کەوتبووە پەلەپەل و تادەهات خێراتر لیێ ئەدا.

ڤیرن رووی رووەو نیللی وەرگێراو سەری لەناو سینەیدا نوقم کردو جوولـەی لە خۆی بری. هەناسەی بە گەردن و سینـەی نیللی‌دا بلاوبـۆوە. نیللی بەئـاسـتـەم دەنگی بەرزکـردەوە و ووتی «ئـوخـەی ڤیـرن» دەستی کـرد بە ماچ کردنـی کولـم و ناوچـەوان و ناودەمـی. ڤیـرن بە تەواوەتی بە ئاگا هات. هەردوو دەستی درێژ کردو «نیللی» توند لە ئامێزگرت.

لە دواییـدا «نیللی» پتر خۆی پیێ رانەگیراو ووتی «ڤیرن ووتی چی؟ پێم بلّی چی گوت؟»

«ڤیرن» هەردوو چاوی کردەوە و بەتەواوەتی لەخەو هەلٚساو چاوەکـانی بری‌یـە «نیللی». «نیللی» لە چاوەکـانیـدا خوینـدیـەوە وەلاّمـەکـەی چی‌یـە. لیێ پرسی «ڤیـرن، کەی؟» «ڤیـرن» ووتی «ئـەمـرۆ» دووبـارە چاوەکانی لێك نایـەوەو سەری لەنـاو سینـەی گەرمـی «نیللی»دا نوقم کردەوە. . «نیللی» کە وەلاّمـەکـەی بیست کەمێـك لیۆی بۆی لەرزی. خۆی پیێ رانـەگیراو پرسی «باشە رووبکەینە کوێ ڤیـرن.» وەك کچوڵەیەکی پچکولە سەیری لیۆەکانی ڤیرن ی دەکرد بۆ ئەوەی بزانیت وەلاّمی چی ئەبێت. ڤیرن سەرێکی بۆبادا و سەری خستـەوە ناو سینـەیـەوەو تونـد هەردوو چاوی نووقـاند. ماوەیەکی دوورو درێژ جوولەیان بۆ نەکـرد. خۆر ناوژ وورەکـەی گەرم داهێـنـابـو هەر دەت گوت هاوینـە نەك پایـز. تینی گەرمیش لە پەنجـەرە ژەنگـاویـە شەقـەو شرەکـەوە بەرز ئەبـۆوە. لەوانەیە پێش هاتنی زستان کەمێك هاوینی تر لەپێش مابیت.

«نیللی» ووتی «ئـەی پێت نەگـوت؟» کەمێـك بۆی راوەستـاو سەیـرێکی دەم و چاوی «ڤیرن»ی کردوو دوایی

# کێوماڵ

● جلیل کاکەوەیس ●

بەرزەفڕ هەڵیڕوانی . . تاچاوبرکات دۆڵەو ئەم بەرو ئەوبەریش شاخی سەرکەش ، لە لوتکەوە تا دامێن ، ئینجا تا قووڵایی ی دۆڵەکە هەربەفرەو بەفر . . لەبەر خۆیەوە گوتی : -

لە لاپەڕەیەکی سادەی نەنووسراو دەچێت کە هیچ شتێکی لەسەر تۆمار نەکرابێت بەڵام هەرچەند ڕۆژێکی دیکەیەو باوبۆران دەی کاتەوە بەلاپەڕەیەکی ڕەشنووس کراوو دەست وخەتێکی ناشیانە ، تەنێ ناوبەناو دەوەنی گەڵاوەریو بەچەشنی تابلۆی نێو چیرۆکی منداڵان خۆی دەنوێنێت .

کامی خەیاڵێکی چرتر بیری دەمە زەرد کرد : -

- ئاخۆ ئەم دۆڵە لای لایەی بۆچەند منداڵ کردبێ وچ داستانی خۆشەویستی وچ ژوانێکی بینیبێ ؟

- ئاسکە ، ئەم بەفرەی ئەمرۆ هەر لە بەفرەکەی پێرار دەچێت !

- کام بەفر؟

- ئەوبەفرەی وا ڕێگاویان گیران ومیوانە زۆرەکەمان هاتن - ئای لەوبەفرە ! - خەڵکی ئەم دێیە باس وخواسی سەیریان لەمەڕ ئەم دۆڵەوە پێیە .

- من حەز بەبەفرێکی وا ئەستوور دەکەم چونکە ئاریانی ئێمە مەگەر بەقەزاو قەدەر ئەگینا بەفری وا هەرگیز نابینن .

- ئای لەوبەفرە ! . . . مەگەر هەر خۆیان بیگێڕنەوەو لە کەین وبەینی ئەم دۆڵە بزانن .

- خۆزگە منیش لێرە دەبووم !

- تۆش وەك پیرەمێردی شاعیر بە تەمای ئەو بەفرەی .

- زۆریش .

- پاش نیوەڕوانێك بوو، بایەکی وەیشوومەدار هەڵی کرد، پەلەوەران کەوتنە هەڵفڕین وخۆیان دەگەیاندە هێلانەکانیان - زۆر جار گیانەوەران پێشبینی باری زەپۆش دەکەن - دنیا کپ ومات بوو، هەورێکی سپی بەری ئاسمانی گرت ، وورده وورده کرێوە دەستی پێ کرد ، شاخەکەی ئەوبەرەوە سپی هەڵگەرا ، دنیا دیوەکان کەوتنە سەربانان وچاویان بڕییە سنگی شاخەکە ؛ لەنێو خۆیاندا دەیان گوت :

- دیسان شاخە ڕووتە هەواڵی پێیە ، ئەوا ئاودامان خۆی سپی پۆش کرد، هەر بێوەی بین، کەتنێك دەکات .

سەودای من وپیرگەل ئاسمان وڕێسان بوو، بەفربارین بەلای منەوە سەودایەکی سەرمەستانە بوو، نیشانەی هات وفەڕ بوو . کێوە ڕووتەش وەکوو هەر کێوێکی دی دەسکردێکی ئەزەلی بوو، بەندیواری بەفرو کێوە ڕووتەش بۆمن شتێکی نوێ بوو، بەڵام ئەوان ئاشنای کەتن وپەتنی بوون ، لێی دەترسان ، حەزیان دەکرد هەمیشە ڕەش پۆش بێت وبەرگی ماتەمینی و نیگەرانی بپۆشێت ، خورەی کانیاوی کپ بێت و دەوەنەکانی هەڵپرو کێن ، جووکەو جریوەی پەلەوەری لێ ببڕێت .



ووردبـــوومـــەوە؛ لەگـەڵ دەستپێچکـەی بەفـرەکـەدا یەکـانگیـر دەبووم دەبوومە تۆپەڵە بەفرێك و بەسنگی کێوە رووتەوە دەگیرسامەوە. لەپڕ هەستێکی دان گر دەروونەمی دەکـرۆشت و دەبـوومە تۆپەڵە بەفرێکی دیو بناگوێی ئەو پیرانەم سر دەکرد.

ـ ئەمـانـە شوومن، کونەپە بوون، نازانن تام و چێژ لە چیدایە، هەستیان نی یە، سوارن، تەپیون!

نازانم چەندم پێ چوو، لە هەیوانی ژوورەکەمدا وەستا بووم، جگـەرەیەکم داگیرسان، مژێکی قوولم لێ ی دا، برێك بەخۆمدا چوومەوەو ویژدانی خۆم دارکاری کرد:

ـ تۆ بڵێی من تەقـە بەتـاریکە شەوەوە بنێم، ئەی نابێ بزانـم رازی ئەم کێـوە چی یـە! هەرچۆنـێـك بێـت من رێبوارێکم بەڵام ئەمان بەشێکن لە کێوە رووتە!

سەرم هەڵبڕی تەماشای شاخەکەی ئەم بەریشم کرد، خەریـك بوو سپی هەڵـدەگەڕا سەرنجی ڕاکێشام؛ نیگام گواستەوە سەری‌و شەیدای ئەمیش بووم ئینجا لەبەر چاوم بوونـــە دوو کیـــژ ۆڵـــەی سپی پێستی کوێستـانی، کپ و بێ دەنـگ دەیـان ڕووانی یـە یەکتـر، بەنیگـا ڕازو نیـازیان بۆیـەکتـر هەڵـدەڕشت و هەریـەکـەیـان باسی عیشقێکی پیرۆزی بۆ ئەوی دی دەکرد.

لەپـڕ دەنگێکی باریـك دای چڵەکـانم. هەمان دەنگ دووبـــارە دای لەســەلا، چری بەفـــرەکـــە دەنگـەکـەی هەڵمژی. . سێیەم جار زۆر بەکەرخی بەرگوێم کەوت:

ـ «کێـومـاڵ. . . کێـومـاڵ، ڕاوکـەران لە ڕاوە پۆڕن، ڕاوکەران لەڕاوە پۆڕن!».

خۆم گورج کردەوە، بەدووی دەنـگـەکـەدا چووم، خەڵـکـێـکـی زۆر چەشنی قەتـارەی قولنگـان بەدوای دەنگەکەدا ڕێچکەیان بەستبوو، لە دۆڵەکەوە بەرەو سنگی کێـوە، ڕووتـە هەڵـدەکشان. منیش دوای ڕێچکەکەم بەر نەدا تا لەسنگی شاخـەکـەدا خەڵکـەکـە ڕێچکـەکـەیـان تێـك دا، هەریـەکـەو بەلایەکدا پەرت بوون. منیش وەك ئەوان بەلایەکی تردا ملم نا؛ گەڕام. . زۆر گەڕام تا لەقەد پاڵێکـدا ڕێکـەوت لەگەڵ جەستەیەکی بەفر بەستووی بێ هەنـاسەی ڕاو کەرێکیان دا یەکانگیری کردم کەلەولایەوە چوار پۆڕی سەر براویش خوێن بەگـەردنیـانـدا چۆڕابـوەوە سەر بەفـرەکـەو ڕەنگێکی سووری ئاڵی دروست کردبوو. منیش لەبەر خۆمەوە گوتم:

ـ هەرچـەن، ڕۆژێکی دیکەیەو ئەم بەفروخوێنەش دا دەچۆڕێنە نێو، ڕوبارو دەریاکان.

چیرۆك :

# دواساتی ژیان

• عثمان حمد احمد •



( ئای ئەوە شلێری خۆشەویستمە . . !! بەخوا ڕێکەوتێکی سەیرە . . . لە خەویشا ئەو ڕێکەوتنەم نەدیوە . )

ـ داخەکەم چەندین ساڵ و عەیامە شلێرم نەبینیوە . بەڵێ . . . ئەو شلێرەی کە هەوای ئەڤینی ئەوەوە گوڵی ژیانم دەرواند .

( بارام زۆر بە پەرۆشەوە چاوی بڕیە چاوی شلێرو کەوتە ئەندێشەیەکی بێ بنەوە ، وەك فلیمێکی سینەمایی شریتی ژیانی خۆیو خۆشەویستیی شلێرو تەرخان کردنی هاوسەری ژیانی کەوتەوە یاد . )

ـ هەر لەتەمەنی یەك ساڵیدا من و گولێزار لە زاری دایك و باوکمانەوە بوینە هاوسەری ژیانی یەکتر .

هەر لە بچوکییەوە لێکیان نزیك دەکردینەوە بەومەبەستە بەڵێنەکەیان بێتە دی . ساڵ هات . . . ساڵ چوو ، گەورە بووم نرامە قوتابخانەوکچە خنجیلانەش وەکو خونچەی تازە پشکووتوو خۆی نیشان ئەدا . .

ئیتر گەیشتمە ئەوتەمەنەی چاکەو خراپەی خۆمم لێك ئەکردەوەو ئەمفامی ، هەر لەم تەمەنەدا تا رادەیەك رێرەوی ژیانم رێك خستبوو . . . لاوێکی تەماع کاربووم ، بەچاوێکی دوور بینیەوە دەم ڕوانییە ژیان . . هەموو ئاوات و ئومێدم ئەوە بوو لە نێو کۆمەڵدا ببمە مرۆڤێکی سود بەخش . . بەلاّم داخم ناچی کە خواوەندی ئەڤین ماڵی شلێری لەسەر ڕێگەی قوتابخانەدا بنیاتنا بوو . بۆ ئەوەی من تووشی داوی ئەڤینی ئەو ببم .

خۆزگەم بەو کاتەی کە گشت ڕۆژێك لە دەرگەی ماڵیاندا ئەوەستاو چاوی دەبریە چاووم . .

بەڵێ ئەوچەند ساتە چاوچاوانی دەبووە هەوێنی ژیانی ڕۆژانەی من و شلێر . داوی خۆشەویستی ی ڕۆژ بە ڕۆژ زێدەتر لە دلما ئەچەسپاو زیاتر گری ئاگری ئەڤین بە دەستی دوو دڵدارەوە خۆش دەکرا .

لە ژووانی چەند ساتێکی کورت و چاو نوقاندا من و شلێر ، لە دوا ڕۆژی ژیانمان بەولاوە بیرمان لە هیچ شتێکی تر نەدەکردەوە . بڵێسەی ئاگری خۆشەویستی لە قولای دڵماندا هەڵدەقولا . .

پاش ئەوەی تەمەنم گەیشە (15) ساڵان باوکم و باوکی گولیزار هەر کاتەی شتێکیان بە گوێچگەمانا دەچرپاندو دەیانویت بەڵێنەکەیان جێ بەجێ بکەن .

دایکی گوڵیزار . . . وەك هەموو دایکێك بەو ئاواتەوە بوو . . کچەکەی دوا ڕۆژێکی بەختەوەری دەسکەوێ و هەمیشە کچەکەی هان ئەدا کە خۆی برازێنێتەوەو هاموشۆی ماڵمان بکات .

بەلاّم لە ڕاستیدا هەموو هەوڵدانێکی بێ فایدە بوو . چونکە من تووشی داوی ئەڤینی کچێکی تر ببووم و خوێنمان بۆ هەوێنی خۆشەویستی یەکتر تێکەڵاو ببوو . . .

ئیتر کەوتمە نێو دووچیای زۆر بەرزەوە کە سەریان لە کەشکەلانی فەلەك دەدا . . یەکەمیان . . بەڵێن و گفتی باوکم ، هەر لەو کاتەی ڕەش و سپیم لێك کردۆتەوە قسەی باوکم نەشکاندووەو کۆی ڕایەڵی هەموو جۆرە کردارێکی بوومە .

دوومیشیان . . . ئەڤینی شلیر . . کە دوو دڵدار چاوەڕوانی دوا ڕۆژێکی رازاوە بوون .

وام لێهات بستێك بەرپای خۆمم بە دی نەدەکرد . . . هاندان و پاڵ پێوەنانی هەردوولا بێ فایدە بوو . لەلایەکەوە کە سەیری ڕۆژانی رابوردووی باوکم دەکرد کە لە پێناوی پێگەیاندنی مندا چەندین جۆر کاسبی دەکردو تاڵی چێشتووە شەوو ڕۆژی بە دەم یەکەوە ئەناو ئیستراحەتی لە خۆ هەڵگرتبوو .

بەڵێ . . . جا چۆن ئەوەم لە بیر بچێ و هەموو ئاوات و ئەمێدی باوکم ئەوە بوو لە نێو کۆمەڵدا ببمە مرۆڤێکی سوود بەخش و دیار بم و خەڵك بڵێین

- بەراستی ماندوو بوونی باوکی دلێر بە فیڕۆ نەچوو . . مەردانە کورەکەی پێگەیاندوو گەیشتە نانی حەلاّڵ . . . دووریش نیە خەڵك بیر لە لایەنێکی تر بکەنەوەو بڵێین . .

- کێ . . . ئەزانی دلێری کوری فلان کەس ئارەق ڕشتنەکەی باوکی لەبەر چاوە ئاخخ . . .

نازانم چ وەلامێکی ڕۆژگاری پڕ مەینەت و ئەشکەنجە بدەمەوە .

داخەکەم بە ناچاری بەردێکی گەورەم خستە سەر دڵم و گشت ئاوات و هیوایەکی ژیانم و لەبیابانێکی ووشکدا خنکام .

ئاخ و سەر ئاخ بۆ نەریتی کۆن . . . !!! چۆن سەدان لاوو گەنج بە گەردەلوولی نەریتی کۆنەوە چرای ژیانیان گوایەوە .

( ئیتر دلێر . . . هەر لەم ئەندێشە دوورو درێژەدا بوو . . ئۆتۆمبێل زرمەی لە ئۆتۆمبیلێکی تر هێناو لە دواساتی ژیانیاندا دلێر و شلێر باوەشیان بەیەکاکردو لە ژووانی یەکجارەکی دا سەریان نایە سەریەك و کۆچی دوایی یان کرد . )

یێ برێکا خودچیت . . ئاگەه ژ بابێ دوینایێ نینه . . هزرەتا وی ئەڤینداراوی (پرژین)ەوچوددی نه . . . دەستێ خویێ دایه بن گوهێ خوو ، یێ لاڤژەوسترانا یێ دبێژیت ، ژ نوی رۆژ یا پەرێن خولواری بەلاڤ دکەت . . ئاگەه ژ خونەی ، سیتاڤکەك هات ولبەر سنگی راوەستیاو پرس ژێ کرن :

- توچ کەسی ؟
+ ئەزرێڤنگم .
- وەغەرا تە چی‌یه ؟
+ ئەڤینداری‌یه !
- کی‌یه ئەڤیندارا تە ؟
+ (پرژین)ە .

پشتی ڤێ پەیڤینێ . . وەکورۆژ بەرێڤەی چیا دبیت . . وەسا ئەو سیتاڤك ژ پێش چاڤا چوو . (کاروان)ی پێلێن هزرو بیرێن خوهەرشەقاندن وکەفتە دویڤ ، نەزانی کا ئەڤە چ تشت بووئەڤ پرسە ژێ کرین وهوزویکا ژبەرچاڤا چوی ، . لسەرچوونا خوبەردەوام بوو ، دارەك کەفتە بەرسینگی



# دل ومان وهیڤی

● بهجت محمد هروری ●

بدەستێ خو گرت .

(باب ئەزدێ رابم چمه مالا ئەوێدیێ . . هەکە هەتا چەند رۆژێن دی نەزڤرم . . پرسا من نەکەن . . دەرکەفت و چو . دلێ بابێ ژێ ب گومان کەفت . . رۆژا وی ژی ئاڤا بوو . . چونکی نەدزانی ئەومالا دێ چیتێ مالا کێ‌یەولکیرێ‌یه . . ئەڤ چونه بوپەلەك لسەر دلێ بابێ .

(گرفتاری‌یەکا مەزن یا کەفتی‌یه بەرسنگێ کورێ من . . بەلێ خودێ توسەرفەرازی‌یێ بدێ) هوسا یێ بوخودبێژیت (کاروان)ی گوند هێلاوکەفتە رێکێ . . ئویێ ددلێ خودا دبێژیت . . ئەوسیتاڤکا پرس ژمن کرین . کا کیمەوچی‌یه هیڤی‌یا من وپاشی گوتی‌یه من خوبسوژە . . . نزانم بوچی

ئەڤ پەیڤینه دگەل من کرن !! ڤ هزرارا چو . ئەڤ پەیڤه باش هل خەپراندوتێك ڤەدا . . (نەدویرە ، نەخوشی‌یەك کەفتبیته بەرسنگێ (پرژین)ێ . . ژبەرهندێ سیتاڤکێ گوتبیته من (خوبسوژە) . . هزراوی‌وگومانا وی بوئەوکو(پرژین) بو نەمایه . . هێشتا پێن خوسڤك کرن وقەستا مالا وێ کر . . خودیت ل ناڤ مالەکا خوشی‌یێ ژێ بارکری . . (پرژین) نەدیت . . مالا بویە لیسێ خەما . . نەدزانی ژبەرچی‌یه . . هەتا وێ گاڤێ ژی بدروستی نەزانی‌یه (پرژین) بونەمایه . . خەما دلێ بابێ وێ نڤاند بو . . روینشتە دەڤ دەیکاوێ . . ب حێبەتیڤە ژێرا گوت :

- هەوە خێرە ؟!

. . رویبنشته بن ویٰ داریٰو کەفته سەر پشتا خوو، پەردا هزرا خوبسەردلی دادا هند دیت جارەکا دی سیتاڤك لیٰ بو هەڤال وژێرا گوت : (خوبسوژە !) وهێلاڤە بتنیٰ . . کاروانی لیٰ کرە گازیو هەوار ، لیٰ خولیٰ نەکرە خودان . . . گەلەك هەرشی . . دلیٰ وی وەکی ئاگرەکی کەفتە تێدا . . خەما قولاچکەکا دلیٰ وی بوخوکرە خانی . . رهێت ترسیٰ د دلیدا شین بوون ، چونکی نەزانی ئەڤە چ پەیڤین بودگەل کریوژ بەرچ خوبسوژیت ! ئینا ڤەگەریاڤەو قەستا مال کر . . گەهەشتە مال . . رویبنشتە دەف بابیٰ خو . .

– تەچی یە کوریٰ من ؟! ئەز دبینم توی نەخوشی !

+ نە باب . . من چو نینە . . ئەز چوبومە گەریانەکیٰ ، ڤێجار ئەز پیچەکیٰ بیٰ وەستیایم .

– گەلەك باشە . . تووەسا هاتی یە پێش چاڤێن من ، هەر وەکی گرفتاری یەکا مەزن کەفتی یە دبەر سنگیٰ تە .

+ نەخێر چو نینە .

رابوسەرخو . . بەرپیپکێن خوگرێدان ، دەرسوکا خوکرە سەریٰ خولسەر وی کولاڤیٰ (پرژین)یٰ بوڤەهاندی . . کالکا خوکرە پیٰ خو . . دوسیٰ نانەك کرنە دپاخلا خوداو گوپالەك



دەیکا (پرژین)یٰ . . هەروەکی ب زوری ئاخفتنا ددەتە دویڤێك . . نەب دلەکیٰ . . ب هەزار دلێن ب خەم بەرسڤا وی دا :

+ دوهی ییٰن هاتین کچا ب زوری یابوئێکی بری ناڤیٰ وی (ئەحمد) . . هندی (پرژین)یٰ دکرە گازی و هەوار . . من بدەن ئەڤینداریٰ من (کاروان)ی . . من (ئەحمد) نەڤێت . . لیٰ پەیڤێن ویٰ دەنگ ڤەنەدا . . ڤێجار دلیٰ مە یٰ بخەمەو ئاگریٰ تێدا . . ژ بەرکو (پرژین) نەگەهشتی یە هیڤی یاخو . . یا نەخوشە .

(کاروان) بدل مایی ڤە دەرکەفت وچو . . . داکو قەستا (پرژین)یٰ بکەت . . سنگیٰ خوب پەیادا رێکەکیٰ ڤەناو

بریٰ کەفت وچو . . . دولەکا مەزن کەفتە درێکیدا . دەنگەکیٰ ژچیا ڤەدای هاتە گوها . . دەنگیٰ تلیلیو زورنایی بوو . . . (دەنگیٰ دەهولا داوەتا (پرژین)یٰ بو . . گەلی خلاس کر . . خەماو دەنگیٰ تلیلیو زورنایی دل وپێن وی پوتێکرن . . کەفتە بەربەرەکیو پالدا . . . هزروبیرێن خوشی یا کەڤن هاتنە بیریٰ . . ئەوا دگەل (پرژین)یٰ رابوراندی . . پاشینەکیٰ بەریٰ خودا وی جیایو ڤسەرکەفت . . پشتی بیهنا خوڤەدای . . رێکەکا گەلەك درێژ بری . . گەلەك وەستی یا . . برس وبیٰ سەروبەریوخەم لیٰ بوونە خودان . . روژیٰ خولیٰ ڤەشارت . . رویبنشتە بەربەرەکیو گوپالیٰ خودانا سەرپێن خووکولاڤیٰ خوژسەریٰ خوکرودانا

بەرسنگێ خوو ما دهزرا (پرژین) یدا . . . .

وەکو ئاگر گوری و تیهنێ ژخودهاڤێت . . پشتی (پرژین) بری یا وەسایە . . ناهێلیت کەس نێزیك ببیت . . هزرەتا وێ ژی هەر (کاروان) ەوبەس هەمی گاڤا یاژ بە رخەم وئێش و گازی یا دبێژیت (کاروان) . . بلا ، ژ بیرامن ناچت روژین من و تە . . . (کاروان) بێ هیڤی نەبە . . هەر ئەزم بوتە . . ئو دکەت هەوار و گازی .

پشتی چەند روژ بورین . . چاڤێ بابێ (کاروان)ی ب شەڤ و روژ یێ ل رێکێ کا دێ کەنگێ زڤرین . . ئەوژی هەر یێ بو خو دبێژیت : (کاروان) کورێ من : (رێکاتە بویا نەهاتنێ . . خودێ دگەل تە بیت گەر کەفتبی یە نەخوشی یەکێ . . گەرژی رێکا ئەڤینداری یێ نەترسە ئەز دێ بوتە ئینم !) چەند روژا بڤی ئاوایی ل خو دکرە ئێڤار . . رابو خو ڤەشداندو ب شویا (کوری)دا چو خارێ . ژ بەر کوتژی بەریك وپاخلێن وی خەمن . . چوخارن دگەل خو نەبرن وچو . . نەزانی دێ چ کەت . . چەوا بچێت . . گەلەك زڤیر بو . . وەستیان و برس و تێهنێ خو کرە پشتیکێ وی . . ژ دویرڤە هندەك شینکاتی کەفتە پێش چاڤا . . (پانێ شینکاتی یا بێ ئاڤ نابیت ) هوسا هزرا خو کر . . قەستا شینکاتی یێ کر . . کاتی یەکا ئاڤێ یا لبەر بو . . تێر ئاڤا زەلالا ژێ ڤەخار . . هشێن وی هاتنە سەری . . جارەکا دی خو ڤەشداندو برێ کەفت . . پشتی هندەك رێ بری . . زەلامەك ژ وێڤە هات . . بابێ کاروانی گەهەشتە دەف . .

- روژ باش (سەلام) .
+ بخێر هاتی .
- تو ژ کیڤە دهێی؟
+ چوبومە داوەتا (ئەحمەد)ی و (پرژین)ێ ل گوندێ . . ێ . . ێ . . ێ هە . . خاترا خوژێ خاست وچو . . بەرێ وی کەفتە وێ دولا (کاروان) ڤێدا چوی . . خوژ وەستیانێ ب هێزتر لێ کرو چوگازی یەك هاتە گوها . . راوەستیاو ماحێبەتی . . (کاروان) ئەو چەند روژە یێ لبەر وی بەری . . ژ جهێ خوژی نەلڤی یە . . گەلەکی برسی یە . . نانێ دپاخلێدا . . لێ ژخەمادا پێ نەحەسیایە . . یێ ژ بەرخەوا دبێژیت :ـ (ئاخ . . ئاخ . . پرژین . . تە ئەز کریمە رێڤگەکێ بێ خوەیی و بێ خودان بەردایە ڤان چولا . . . ئەز دێ مرم (پرژین) . . بێ تە . . من تیە ژیان . . نەشێم بژیم . . ) ئویێ ژینێ پێ یا دکەتە هەوار و گازی . . بابێ وێ لدویڤ دەنگێ وی چو . . بەرێ خودایێ یێ رازایە لبەر بەرەکی . . . بێ سەرو بەری و برسێ یا خوبسەر دادای . . چو دەڤ خوتێ وەرکر

- تە خێرە کورێ من ؟!

لێ ژ بەر برسێ وخەما نەشیا چوبەرسڤا ژ بابێ خورا بدەت . ئینا راکرە ژێیرڤە . . دەستێ وی کەفتە سەر پاخلاوی بەرێ خودایێ کوتژی نانە . . ئینا دەرێ . . هندەك ژێ خار . . یێ دی دا (کاروانی) بچی رێکا هەی (کاروان) گەهاندە گوندی . . کەس و کارێن وی لێ خر بوون . . . پسیارا ڤێ چەندێ ژ بابێ وی کر . .

لی چو بەرسڤێن بدروستی ژێرا نەدان ژ بلی کوگوتی یێ . . (من درێکا خودا (سەلام) دیت من گوتێ : تو ژکیڤە دهێی ؟ گوت ژ داوەتا (ئەحمەدی و پرژینێ) . ئو ئەز ل دولەکی ڤسەرکەفتم دەنگەك هاتە گوهێ من . . دنگێ کاروانی بو . . یێ دبێژیت : (ئاخ پرژین . . ئەز مرم . . ئاخ پرژین . . تە ئەز هێلایمە بتنێ بەردایمە ڤان چولا) ڤێجار نەدویرە ژخەمێت (پرژینێدا) هولێ هاتبیت . . رابون ئاڤ و نان بوئینان . . هەتا تێر خاری و ڤەخاری . . هشێت وی هاتنە سەری . . گەلەك ما حێبەتی . . . ئەز لکیرێ بوم . . نوکە ئەز یێ لکیرێ ! . . (پرژین) . . بخودێ تو بومنی ئەز نامرم (پرژین) . . هندێ چپکەکا خوینێ دلەشێ من مابیت . . بزاڤا من دێ بوتە بیت . . لمن سوزە (پرژین) ئەز بوتە مەو تو بومنی . . . دلێ من دێ هەر مینیت و گەهیتە هیڤی یا خو . .

# لەشارێكی تاوان باردا



چیرۆكی: كاریل كانبك

وەرگێرانی: غەفوور میرزا كریم

لەناكاو شەوێ لە شەوان دوو فریشتە لە ئاسمانەوە هاتنە خوارەوەو خۆیان بەناو شاری (سەدووم) داكرد.

كاتێ حەزرەتی لووت بەم هەواڵەی زانی بەخێرایی بۆ دیدەنی بەرەو پێشوازی یان چوو ولەبەردەمیان دا بەچۆكا هات و مل كەچ راوەستا.. چاوەنواڕی راسپاردەی فەرمانی خوای گەورە بوو.

پاش دیدەنیو گفت و گۆو ووت و وێژ لەگەڵیاندا پێی ووتن..

تكام وایە ئەم شەو لە ماڵی بچووكی خۆتان دا هەوارگەی میوان داری بخەن و، لەبەری بەیان دا ئەتوانن بڕۆن و ئەركی لسەرشانتان بەجێ بهێنن بەڵام فریشتەكان لەوەرامدا وتیان... بەداخەوە ئێمە لێرە نامێنینەوە شەوی ئەم شەو لە كووچەو كولانی ناوشاردا ئەبەینە سەر.. پاشان ووتیان.. ئەوەی پێویستە پێت رابگەیەنین ئەوەیە كە پێویستە بەزووی خاوو خێزان و كەس و كارت لەشاردا كۆبكەیتەوەو، لەناو شاردا نەمێنن.

چونكە ئێمە فەرمانمان پێ دراوە كە ئەم شارە سەرەوژێر بكەین.. ئەم شارەی كە بەچەشنی نقوم بوون لە دەریای گوناهباری دا بەرەنگێ دەستیان داوەتە خراپەكاری كە خوای گەورە بەهیچ جورێك نایان بەخشێت و لە تاوانیان خۆش نابێت.

حەزرەتی لووت کاتێك ئەم هەواڵە جەرگ بڕەی بیست : -
چاوی پڕ لەگریان بوو پەستی و پەژارەو ماتەمی دای گرت و، کەوتە پرسین . . جا لەبەرچی شار چۆڵ بکەم؟
فریشتەکان وتیان :
چونکە خوای گەورە نایەوێت کە پیاوی چاکی بێ گوناهی وەکوو ئێوە لەناو دۆزەخی ئاگردا بسوتێنێت .
حەزرەتی لووت بەپەستی و وەنارەزایی و رووگرژی یەکەوە هاتە قسەو وتی :
دەسا رێگەم بدەن تابڕۆم بۆ ناو شار تا خاوو خێزان و کەس و کارم بە ئاگابێنم و، ئەم هەواڵەیان پێ رابگەینم . . تابکەوتە خۆیان ، پێ لەکەوش توند بکەن و خۆیان لە فەوتاندن رزگاربکەن و لە شار دەرچن .
بەم چەشنە عەزرەتی لووت بە هەڵەداوان خۆی کرد بەشارداو بەهەموو هێزێکیەوە کەوتە هاوار وبانگ کردن و ئەیووت خەڵکینە گوێ بگرن . .
بەخێرای شار چۆڵ کەن و بەزوویی رابکەن وخۆتان سەرفراز کەن .
چونکە خوای گەورە فەرمانی سەرەو ژێر کردنی ئەم شارەی داوە .
بەڵام بەداخەوە خەڵکەکە گوێیان بەم بانگەوازە نەداو، هیچ گرنگی یەکیان بەووتەکانی نەدا بەم چەشنە حەزرەتی لووت بەدڵ شکاوی بەرەوماڵەوە گەڕایەوە .
خوا خوای ئەوە بوو کە سەرخەوێك بشکێنێت ، بەڵام هەرچەندی ئەکرد خەو نەئەچووە چاوی بۆیە دەستەو ئەژنۆ دانیشت بە بیرکردنەوە پەژارەو خەمەوە شەوگاری ناخۆشی بردە سەر .
کاتی بەرەبەیان فریشتەکان سەرلەنوێ هاتنەوە بۆلای حەزرەتی لووت پێیان راگەیاند کە پێویستە بە زوویی خۆی و خێزانی لە شار دەرچن تا لەگەڵ تاوانباراندا نەبنە خۆراکی مارو مێرو.
بەڵام حەزرەتی لووت . . هاتە قسەو وتی . . . نەخێر، نەخێر . .
هەرگیزاو هەرگیز شار بەبێ ناهێڵم ، شار چۆڵ ناکەم .
ئەوەی ڕاست بێ شەوگاری ئەم شەوبەدرێژایی من لەدەروونم دا تاووتوێی هەڵس وکەوتم بەبیرم ئەکرد تا لە ئەنجامدا هاتوومەتە سەر ئەو بیروڕای نەگۆڕە، بڕیارێك کە نابێ هەرگیز دەست لە شار هەڵگرم و بچمە دەرەوە چونکە منیش یەکێکم لەوان ، ژیان و چارەنووسم بەوانەوە بەندە .
فریشتەکان کەوتنە قسەو وتیان . . .
تۆ پیاوێکی چاك ودانای خەڵکی شاری (سەدووم) زۆردارو خراپ کارو تاوان بارن خوای گەورە قینی لێ هەڵگرتوون ، ئەیەوێ سزای مەرگیان بدات . .
ئیتر ناشێ بۆتۆ خۆت بکەیت بەهاوڕێیان پێویست ناکات بیت بەهاوپشتیان ، تکامان وایە بیرت بگۆڕە . . دەستیان لێ هەڵگرەو خۆت لەچارە ڕەشی دووا رۆژ یان دوور خەرەوە .
حەزرەتی لووت ووتی : -
من لە قسەکانتان تێ ناگەم . . جارێکی تریش دووپاتی ئەکەمەوە کە لەبڕیاری خۆم هەرگیز پاشگەز نابمەوە هەرگیز لە خەڵکی (سەدووم) دەست بەردار نابم .
لە گەڵیاندا رۆژگارێکی تایبەتم بردووەتە سەر هاوبەشی رازو نیازیان بووم .
فەرمانڕەوایم بەسەر کارو باروو هەڵس و کەوتیاندا ئەکرد هەندێك جاریش تاڵاوی زۆرداریم بەگەروودا ئەکردن ، بەڵام هەر چۆنێك بێت ئەمرۆ لام ستەمە کە بڕیاری لەناوچوونیان بەسەردا ئەدرێت .
بەڵێ ئاگاداری شاری (سیجور)م شارەزای باروو دۆخیم زۆر جاریش چوومەتە دیدەنییان و ئەوڕاستیەش ئەسەلمێنم کە خەڵکی ئەم شارە لە خەڵکی شارەکەی من بە ئایین ترو پیاو چاکترو باشترن .
فریشتەکان هاتنە وەرام و ووتیان :
دەم خۆش کوا لەمە باشتر هەیە؟
دەهەڵسە ئەم هەلە لە کیس خۆت مەدە، بڕۆ بۆ شاری (سیجۆر)، هەوارگەی خۆت لەوێ بخە، تا لە مردن سەرفراز بیت چونکە (سیجور) بەئارامگایی ئەمێنێتەوەو سەرەو ژێر ناکرێت .
حەزرەتی لووت ووتی : -
هیچ پەیوەندیەکی ئەوتۆم بە (سیجۆر)ەوە نی یە تەنها هەر پیاوێکی ئایین پەروەری لێ ئەناسم کە ئەویش بەوێنەی من

وورده سکالاّیەکی لە خەڵکی شارەکە هەیە، زۆر ووتن باش نی‌یە.

قسە هەزارەو دووانی بەکارە..

من ناتـوانم دەست لە شاری (سـەدووم) هەڵبگرم. چونکە رەگی ژیانم بە خاك و خۆڵ وئاوییەوە ئالاّوە.

فریشتەکان ووتیان: ـ

جارێـکی تریش پەنـایـان بردەوە بەر حەزرەتی لووت و، بەپـەرۆشـەوە کەوتنـە وپـارانـەوە لی‌ی کەئـامۆژگاری‌یەکانیان بەجێ‌بهێنێت و بەخێرای لە شاری (سەدووم) دەرچێت.

چونکـە بریاری سەرۆژێرکردنی ئەم شارە دراوە. حەزرەتی لووت زۆر بەشێنەیی وەولەسەرخۆ ووتی: ـ

با فەرمـانی خوای گەورە هەرچۆنێـك بێت، شەوگاری ئەم شەو هەردەم بیـرم ئەکـردەوە، خەو لەچاوم نەئەکەوت، جێگام بەخۆم نەئەگرت، هەرساتە ناساتێك یادگاری رابووردووەکانی شاری (سەدووم)م بیر ئەکەوتەوە.

گۆرانی و پێکـەنینی خەڵکی (سـەدووم)م بیـر ئەکـەوتـەوەو ئەهاتە بەرگوێ.

نەخێـر ئێـوە ئەم خەڵکـە نانـاسن و تێ‌یـان ناگەن. چونکە ئەگەر لە گەڵیاندا بژیبانە هەرگیز ئەم فەرمانەتان نەئەگرتە ئەستۆ.

ئاخ ـ خۆزگــە کچـانــی ئەم شارەتــان ئەبـینی کە چۆن بەلـەنجـەو لار بە گۆرانی ووتنـەوە لە شەقـامـەکان ئەم شارەدا گوزەر ئەکـەن یان کاتێـك لە کانیــەوە دەست بەگــۆزەو دەم بەپێکـەنین، بەرەو ماڵـەوە ئەگـەڕێنـەوە. لەم جیهانەدا ئاوێك نی‌یە لە ئاوی (سەدووم) پاکترو روونتر بێت.

لەم جیهانەدا نیە لە زمانی (سەدووم) خۆشترو شیرینتر بێت ئەگـەر منـداڵێکی سەدوومی قسـە بکـات وا ئەزانم کە کوری خۆمە قسە ئەکات.

یان کاتێــك کە یاری ئەکـات بیـرەوەری منـاڵی خۆمم بیـر دەکــەوێتـەوە کە هەرگیـز لە یادمـە وورکم ئەگـرت و دایکم بە زمانی سەدوومی ژیری ئەکردمەوە..

ئەمــانـەی من ئەیڵێم و باسی ئەکـەم وا ئەزانم دوێنی یە.

یەکێك لە فریشتەکان ووتی: ـ

خەڵکی سەدووم تاوان بارن، خەتــایــان ئەوەنـدە گەورەو گرانـە خوا نایـان بەخشێت بۆیـە.. حەزرەتی لووت قسەکەی پێ بری‌و ووتی: ـ

بەلاّم ئاخــۆ ئەبێت چی بکـەین بەرامبـەریـان، بەچـاوی خۆتان ئەو کۆمەڵە خەڵکە ئەبینن، ئەووەستایانەی ناوشار کە بە پەنجـەی هونەریان گۆزەو دیزەی جوان لەگڵ دروست ئەکەن، بەدەست و نقـامی رەنگینیـان پارچـە کەتـان ئەچنن، مرۆڤ کاتێك ئەروانێتە بلیمەتی و هونەری‌یان لە خۆشیاندا شاد مەرگ دەبێت.

لەتەماشاکردنی وەستاییان و کارامەییان هەرگیز تێر ناخۆن.

جا ئەگەر ئەم کۆمەڵە خەڵکە بکەونە داوی تاوان باری‌وخراپەوە دیارە مرۆڤ نەك هەر تەنیا قینی لێیان هەڵئەسێت و تاوانبارانی وەستـای شاری (سیجـۆن) زیـاتـر لێیـان توورە ئەبێت. بەڵکو هەست ئەکات کە خۆشی بەشداری‌ی تاوانیانە.

جا ئێـتــر ئەبێ من گونـاهم چی‌بێت ئەگـەرخەڵکی شاری سەد ووم بم!

جا ئەگـەر نیـازتان وایە سەدووم سەرۆژێر بکەن.. وامنیش با لەگەڵیاندا بمرم و بفەوتێم...

دیـارە من پیاوێکی چاك نیم، بەڵکو یەکێکم لەوان، بۆیە شار بەجێ ناهێڵم.

فریشتەکان روویان گرژ کرد بە توورەییەوە ووتیان: ـ

کەواتــە تۆش چارەت وەکــو چارەی ئەوانــی لێ دێــت.

حەزرەتی لووت هاتە وەرام وە ووتی: ـ

بەڵێ باوابێت!! تەقـەلا ئەدەم کە رزگـاریان کەم لە مردن، هەرچەندە نازانم رەنجی ئەم تەقەلایەم بۆکوێ ئەچێت؟

بەلاّم لەوباوەرەدام کە پێـویستـە لە سەرم یارمـەتیان بدەم و ئەم ئەرکە بگرمە ئەستۆم.

بەراستی زۆرم لاستـەمە کە دستیان لێ هەڵگرم. تەتانەت ئەگـەر خوای گەورەش دوێنێش فەرمـانی پێ بکردمایە کە شار چۆڵ بکـەم داوای پشوودانێکم لێ ئەکرد. لی‌ی ئەپارامەوە کە دەرفـەتێکم پێ بدات تا کەمێـك لەگـەڵیـانـدا بکەومە ووت و ووێژ و ئاخافتن.

وەکـو ووتم من رۆژگـارێکی زۆرژیانم لەگەلیاندا بردووەتە سەر، ئیتـر چۆن دلم بروای دێت ئەمـرۆ لەم تەنگـانـەیـەدا دەستیان لێ هەلبگرم.
ئایا منیش تاوانی خەتایان هەلناگرم؟
حەزنـاکـەم بمـرم بەلام ناشتوانم خۆم ڕاگرم کەلەبەر چاوم ئەوان بمرن بۆیە بریارم داوە کە هەر لەشاردا بمێنمەوە.
فریشتەکان ووتیان: -
بەلام هەرگیـز ناتـوانی سەدووم لە چارەنـووسی رەشی داهاتوو رزگاری کەیت: -

حەزرەتی لووت ووتی: -
بەلێ ئەزانم بەلام لە هەولدان بۆ ئەم مەبەستە دریغی ناکەم من هەنـدێ جار خەتـام بەرامبـەریـان کردوە، هەر وەهـا زۆر داری‌و تاوانی ئەوانیشم هەلگرتووە.

ئیتر خوای گەورە لەمەزیاتر ناتوانم بلێم. بەکورتی ئەمەوێ چارەنووسم لەگەل چارەنوسیان بێ فریشتەکان: -
هاواریـان لە حەزرەتـی لووت کرد ووتیـان زووکـە شار بەجێ بهێلە: - خاوو خێزانـەکـەت سەرفراز کە لە کردن بەلام حەزرەتی لووت بەکـەمتـەرخـەمیـەوە گوێی لە قسـەکـانیـان ئەگرت تا لە دوای دا فریشتەکان..
هەلسان وەدەستی هەموویانی گرت و لە شار دەری‌کردنە دەرەوە.

حەزرەتی لووت بەناچاری شاری بەجێ هێلا هەرچەندە کە دل و مێشکی هەر لای (سـەدووم) بۆوزمـانی حالی ئەیـوت بەلێ ئەی شاری خۆشەویستم. ئەگەر چاوی‌یشم بنوقێنم هەر ئەتینم..
چونکە تۆ لە دل و هەناو مایت هەروەکو منیش لەناو تۆ دام..
(سـەدووم) تۆ جوانتـرین وولاتی لە جیهـان دا.. بەزۆر بەهاوار بە گریان لە شاریان دەرکرد.

فریشتەکان پێ‌یان ئەووت: -
تکـایـە خێرا برۆ، خۆت رزگار کە، ئاور مەدەرەوە بۆ دواوە، لەم دەشتەدا مەمێنەرەوە، خێرا کە بەرەو چیا راکە، تا رزگاربی لە مردن.
ئا لەم کاتـەدا کە فریشتـەکـان ئەم قسـانـەیان بە حەزرەتی لووت ئەووت، تازە رۆژ هەلئەهات وپرشنگی زیرینی بە سەر شاری (سـەدووم)دا ئەپـەرژان تا لەم کاتــەدا بو کە شاری (سـەدووم)و عەمـوریـە نغـور بوو، ئەرز هەلی لوشی بەردی بەسەر دارەوە نەما.. ئاگر لە هەموو لایەکیەوە بەرز ئەبووەوە.
حەزرەتـی لووت لای شاری سەدوومـی بەم پەریشـانی‌و سەرگەردانی‌یەوە بینی بەهەلەداوان.
دل پر لەخەم و پەژارە بەرەو شاری کاول بووی سووتاو رۆویی.
فریشتەکان: -
دوای‌کـەوتن هاواریـان لێ‌ئـەکرد، بەسە مەرۆ، ئەوەنیازت چی‌یە وارا ئەکەیت، بۆوا...
شلەژاوو پەشۆکاوی:
حەزرەتی لووت: -
ئەرۆم تا یارمـەتـی خەلـکـی (سـەدووم) بدەم، بەدەم هاواریانەوە ئەرۆم...
شار ئەسـووتـاو وێـران و سەروژێـر ئەبوو کاتێك حەزرەتی لووت پێ‌ی خستە ناو دەرگای شارەوە.
تێبینێ: لەنـوسینی (کـاریل کانبك)ی چیکوسلوفاکی لە کتیبی (قصص مختلفـە)ی سلامـە موسی چاپی قاهیـرە لە کتیخانەی تایبەتی مامۆستا مصطفی محمد سعید لە سلێمانی وەرم گرتوە وەرم گیراوەیە سەرکوردی.

# دواوشە

## تازە بە تازە نوێ بە نوێ

لەگەڵ هەڵاتنی ژمارە نەوەت ونۆی بەیان وا پێمان نایە ساڵێکی نوێوە، ساڵەکەش ساڵێکی ناورۆژمێرنیە، واتە نە ساڵێکی زاینی یەو نە کۆچی نە رۆژهەڵاتی یەو نە رۆژئاوایی، نەکوردی یەو نەچینی، بەڵکو ساڵێکی نوێ یە لە کاروانی زانست و زانیاری وولاتەکەماندا، ساڵێکە دەرگەی هەزارەها باخچەی منداڵان و دایەنگەو قوتابخانەو ئامۆژگەو کۆلیجەکانمانی لەسەر گازی پشت کرایەوە بۆ ئەوەی ملیۆنەها کچ و کورمان بگرێتە کۆش و فێری خوێندەواریان بکات مێشکیان زاخاو بدات و دەروازەی رۆژانەی داهاتوویان بۆ وازبکات.

منداڵی ساوا، کە لە ساڵی یەکەمیدا دەبرێتە دایەنگاو باخی ساوایەنەوە تازە پێی گرتووەو بە ئاستەم ووشە لێك جیا دەکاتەوە، ساڵ دێت و ساڵ دەروات پێ دەگات ولەسێبەری مامۆستاکانیدا نەشونمادەکات و مێشکی ئاوئەدرێت، نزیکەی بیست و پێنج ساڵ لە تەمەنی ئەبرێت ئەوسا سەر لە قۆناغەکانی خوێندنەوە بەرزئەکاتەوە ئەبێتە ئەندامێکی ئەوتۆ کەڵك بە وولات بگەیەنێت.

پەروەردە ئەڵێت منداڵی ساوا (پیاوێکی بچکۆلانەیە) ئەم پیاوە بچکۆلانەیە تا ئەبێتە پیاوێکی گەورە ئەو قۆناغانە دەبرێت کە باوباپیرانی لەدێرزەمانەوە لە ئەشکەوتەکانەوە پیادا گوزەریان کردووە، بە سادەتر بڵێین، منداڵ هەندێ جار (مان ئەگرێت، شت ئەشکێنێت، خۆپەرست ئەبێت، شت کۆئەکاتەوە) ئەمانە هەمووی ماکی ئەو قۆناغانەی ناومێژوون، باوك و دایك و مامۆستا ئەبێت لەم رەوشتانەی منداڵەکانیان قارس نەبن و لێیان توورەنەین بەڵکو هەوڵ بدەن بەشێوەیەکی پەروەردەیی چارەسەریان بکەن، وەك ئەوەی شت ومەکی گونجاویان بۆبکرن و تێرو تەسەلیان بکەن و رێزیان بگرن و رۆژنامەو گۆڤاری منداڵانیان بۆدابین بکەن، ئەگەر بێتو ئەو خوورەوشتانەیان لە منداڵیەوەو بە شێوەیەکی پەروەردەیی چارەناکەن ئەواتا گەورە ئەبن خووەکەشیان لەگەڵدا گەورە ئەبێت و کورد ووتەنی (خویەك فێربووی بەژێری تەرکی ناکەی بەپیری)، هەر رەوشتێك وهەر قۆناخێك چارەی خۆی هەیەو ئەویش بە هاوکاری نێوان باوکان و مامۆستایان دێتەکایەوە، پێویستە باوك ودایك هەمیشە بچنە قوتابخانەو سۆراخی خوورەوشت وچالاکی ووریایی رۆڵەکانیان لە مامۆستاکانیان بکەن تاوەکو جگەرگۆشەکانمان بینە ئەندامێکی بەبەرهەم.

هەر لەم مانگەشدا وا گۆڤارەکەشمان بەرەو قۆناخێکی تازە دەروات، مانگی داهاتوو کە ژمارە سەدتان دەکەوێتە بەردەست گۆڤاری (بەیان) پانزدەساڵ لە تەمەنی دەبرێت، ئەمەش یەکەم گۆڤاری کوردی یە کە ئەم تەمەنە درێژەی بری بێت و بووبێتە لاوێکی خاوەن شانۆ بالایەکی پتەو، هەروەها گۆڤاری (بەیان) یەکەم گۆڤاری کوردی یە کە کالایەکی ئەدەبی پووشیبێت واتە پسپۆربێت بۆ چارە سەرکردنی بابەت ولق وپۆپەکانی ئەدەب، تەمەن درێژی ئەم گۆڤارەش ئەکەوێتە ئەستۆی ئێوە، ئێوەی نووسەرو خوێنەرانی ئەم گۆڤارە.

بەڵێ وا پێمان نایە ساڵێکی نوێی قوتابی و قوتابخانەکانماوە هەروەها پێ دەنێنە ساڵێکی تازەی بەیانەوە، وابزانم هەقمانە بڵێین (تازە بەتازە نوێ بە نوێ).

مستەفا نەریمان

بەیان

مجلة ادبية شهرية

تصدر عن دار الثقافة والنشر الكردية

وزارة الثقافة والاعلام

بغداد

رئيس مجلس الادارة ورئيس التحرير

مصلح مصطفى الجلالى





**BAYAN**

Litrary Monthly Magazine

Ministry of Culture and Information

Issued by: The Kurdish House for Cultuer and Publihing

Baghdad - Iraq

EDITOR IN CHIEF

**MUSLEH MUSTAFA JALALY**

دار الحرية للطباعة ـ بغداد

نرخى (200) فلسه